# زمان، هزر و کولتور

**وەرگێڕانی**

**ڕەحیم سورخی**








**ناوی کتێب: زمان ، هزرو کەلتوور**

- وەرگێڕانی: ڕەحیم سورخی
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جمال رواندزی
- بەرگ: ئاسۆ مامزادە
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- ژمارەی سپاردن: ٨٧٦
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپی یەکەم ٢٠٠٦
- نرخ: ٢٠٠٠ دینار
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە (هەولێر)

زنجیرەی کتێب (١٩٥)



دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی
www.mukiryani.com
asokareem@ maktoob.com
Tel: 2260311

# ناوەرۆک







## پێشەکی

«زمان و هزر و کولتور» ناوی وتارێکی بەناوبانگی پۆل هێنلەیە لە بارەی تیۆرییەکەی وۆرف لە پێوەندی لەگەڵ ڕێژەیی بوونی زمان، کە لێرەدا هاتووە، بەڵام ناوەرۆکی هەموو وتارەکان، ناونیشانی (زمان، هزر و کولتور) دەیان گرێتەوە. هەربۆیە وەك ناونیشانی ئەم کتیبەش هەڵبژێردراوە. خاڵی هاوبەشی هەموویان بێجگە لە یەك وتاریان کە تەنیا پێوەندیی بە زمانەوە هەیە؛ لە *فەلسەفی* بوون و *هزری* بوونیان دایە. هەرکام لە باسەکانی ناو ئەم کتێبە سەرچاوەیەکی نوێ و بەنرخن، کە لە زمانی کوردیدا یان هەر باس نەکراون یان ئەگەر باسیش کرابێتن بە پوختی باس نەکراون. واتە چونکە بابەتیانە و بە دوور لە پێشداوەرین، دەتوانن ببنە هەوێنی باسە زانستیی و رۆشنبیرییەکانی کوردی. [هەڵبەت بەو مەرجەی نووسەری ئەم دێڕانە توانیبێتی لە وەرگێڕانی ئەم باسانە دا سەرکەوتوو بوو بێت، هیوادارم وا بێت! سپاسی هەموو ئەو خوێنەرە وردبینانە دەکەم، چاو لە هەڵە و پەڵەکانم ناپۆشن و تێبینییەکانیان، بە نووسین یان گوتن دەگێڕنەوە ].

## پێشەکی

تیۆری «سەرەڕۆیی رۆژ هەڵاتییانە» کە بە هۆی مۆنتسکیۆوە شێوەی داڕێژراوی ئەمڕۆییانەی بەخۆوە گرت، لەژێر کاریگەریی بیرۆکەی «ئەورووپای ناوەندی»دا و بە پشتگوێ خستنی رۆڵ و پشکی ژیارە دێرینەکان لە پێکهێنانی کولتوری و کۆمەڵایەتی جیهان، چەند پێناسەیەکی تایبەتی بۆ رۆژهەڵاتی ناڤین بە دوادا هات. مۆنتسکیۆ پێیوا بوو رێکخراوەی سیاسیی ئاسیایی لەسەر ***دوو هۆکاری سرووشتیی*** بەرچاو؛ ***هەبوونی پێدەشتی بەرین و ناهەمواریی کەشوهەوا و سەرەڕۆیی رۆژهەڵاتییانە*** دامەزراوە. ئەم تیۆرییە بوو بە بناغەی پێشداوەریی زۆربەی نووسەران و خاوەنڕایانی ئەورووپی لە«هیگل»ەوە تا «جۆن ستوارت میل» و لەو دەلاقەیەوە روانیانە کۆمەڵگە ئاسیاییەکان و بەوپێودانە هەڵیانسەنگاند. بەتایبەتی لەرێگەی (شێوەی بەرهەمهێنانی ئاسیایی مارکس)ەوە هاتە هەرێمەکانی رۆشنبیریی هاوچەرخیشەوە. تیۆری مارکس کە بە شێوەیەکی گشتی کاردانەوەیەك بوو لە بەرانبەر سەفەرنامەی فرانسوا بێرنییە، پزیشکی فەڕانسی لەسەر (ئەورەنگی زەیب)و سوڵتانی هیندستان و لە سەر ئەو خاڵە پێی داگرت کە موڵکداریێتی و خاوەنێتیی زەوی لەبەر بێ ئاوی لە کۆمەڵگە رۆژهەڵاتییەکاندا رایەڵە و تۆڕی «حکوومەتی مەزن، چەسپاو و سەرەڕۆیی رۆژهەڵاتی» پەیدا بووە.

تیۆریی بەرهەمهێنانی ئاسیایی مارکس دیسانەوە بە هۆی «تیۆریی کۆمەڵگەی ئاودێریی» (کارل ویتفۆگل) بە شێوەیەکی دیکە لە نیوەی



دووەمی سەدەی بیستەمدا بەرهەم هاتەوە. بەپێی ئەم تیۆرییە لەبەر زەرووڕەتی سروشتی جوگرافیایی، کە هەمان کەمیی ئاو لە ئاسیا دایە، پێکهاتووە و سیستمی سیاسی شیاوی خۆی بەدی هێناوە کە دەزگای مەزنی دیوەخان سەروەرییە. واتای سەرەڕۆیی (Despotism) یش نەوەك دیکتاتۆری بە چینەکان پشت گەرمە و نە بەیاسا سنووردار دەکرێ. لە راستیدا لەوەها کۆمەڵگەیەکدا کە هەموو مافەکانی لە سنووری دەوڵەتدایە، هەموو ئەرکەکانیش لە ئەستۆی دەوڵەتە (دەوڵەت رەوابوونی خۆی تەنیا لە رێگەی واقیعیەتی دەسەلاتی خۆیەوە پێدەگات و هەر بۆیەشە یاسا، واتە چوارچێوەیەك کە بڕیارەکانی دەوڵەت تاڕادەیەك سنوردار و پاشانیش شیاوی پێشبینی بکات لە ئارادا نییە).

(وەرگێڕ)

**كارل ويتفۆگل لەبەرهەمە بەناوبانگەكەيدا اسەرە رۆیی رۆژهەڵاتییانە) دەنووسیٚ:**

كاتێ كە لە سەدەكانی شازدەیەم و هەڤدەیەمدا، بەهۆی شۆڕشی پیشەسازیی و بازرگانییەوە دەسەڵات و بازرگانی ئەورووپی سەرانسەری جیهانی داگرت، ژمارەیەك گەشتیار و توێژەری وردبینی رۆژئاوایی، داهێنانێكی عەقڵی گرنگیان بەدی هێنا كە هاوشانی داهێنانە گەورە جوگرافییەكانی ئەو سەردەمە بوو. ئەوان پاش رامان و پێداچوونەوەیان بە سەر ژیار و شارستانییەتی رۆژهەڵاتی نزیك (چین و هیندستان)دا، ئەم خاڵەیان بۆدەركەوت كە ئەوەی لەم ژیارانەدا بەرچاوە، پێكهاتەی هێندێ تایبەتیی دامەزراوە كە نە لە یۆنان و رۆم و نە لە ئەورووپای سەدەكانی ناوەڕاست و نۆێدا هەبوو. ئابووریزانانی كلاسیك لە ئاكامدا تێگەیشتنی چەمكییانەی خۆیان بۆم داهێنانە بە زاراوەی كۆمەڵگەی تایبەتی «رۆژهەڵاتی» یا «ئاسیایی» دەربڕی.

كاكڵی هاوبەشی ئەم كۆمەڵگایانە ئاشكراتر لە هەموو شوێنەكان لە دەسەڵاتی دیكتاتۆرانەی سەرچاوە سیاسییەكەیانەوە دەردەكەون. وانەبوو كە حكوومەتە زاڵمەكان لە ئەورووپادا نەناسرێن، سەرهەڵدانی سیستمی سەرمایەداری لەگەڵ سەرهەڵدانی دەوڵەتە تاكڕەهەندەكاندا هاوكات بوو، بەڵام چاودێرانی رەخنەگر وا تێگەیشتن كە حكوومەتی تاكڕەهەندی رۆژهەڵاتی بە لێبڕاوی گشتگیرتر و سەركوتكەرتر لە حكوومەتە



هاوچەشنەكانی خۆیان لە رۆژئاوادا بوون. لە روانگەی ئەوانەوە دیكتاتۆرێتی «رۆژهەڵاتی» بێبەزەییترین شێوەی دەسەڵاتی توتالیتێر[١] دەنوێنێ.

زانایانی زانستە سیاسییەكان وەك مۆنتسكیۆ، بەر لە هەر شت، هۆگری ئەو كاریگەرییە پڕ ئازارانە بوون كە سەرەڕۆیی رۆژهەڵاتی دەیخستە ئەستۆی تاك و؛ توێژەرانی زانستی ئابووری حەزیان لەتوێژینەوەی پانتای بەرێوەبەرایەتی و خاوەنێتی ئەو جۆرە حكوومەتانە بوو. بەتایبەتی ئابووریزانانی كلاسیك كەوتنە ژێركاریگەریی ئەو هەوڵە بەربڵاوانەی كە حكوومەتی رۆژهەڵاتی بۆ رایەڵەی ئاودێری و كشتوكاڵ بۆ دامەزراندنی پێوەندی دەیدان. سەرەنجام ئەوان وا تێگەیشتوون كە لە رۆژهەڵاتدا حكوومەت گەورەترین خاوەنی زەوییە.[٢]

بەڵام چەمكی سەرەڕۆیی[٣] لە سەردەمی فەیلەسووفانی یۆنانی كۆندا بۆ وەسف كردنی حكوومەتە ئاسیاییەكان بە كاردەبرا. بۆ نموونە ئەرەستۆ لە كتێبەكەیدا (سیاسەت) دەنووسێ:

***رەوشتی بەربەرەكان زیاتر حەزی لە كۆیلەتییە تا رەوشتی یۆنانییەكان، رەوشتی ئاسیاییەكانیش پتر هۆگری كۆیلەتییە تا رەوشتی ئەورووپییەكان. هەربۆیە ئاسیاییەكانیش حكوومەتی سەرەڕۆ بە بێ نارەزایەتی دەربڕین پەسند دەكەن.***[٤]

لە سەردەمە نوێیەكاندا لە نێوان فەیلەسووفانی سیاسیی رۆژئاوادا، ماكیاڤیلی یەكەمین كەسە كە حكوومەتی عوسمانی بە خاڵی بەرانبەری رێژیمە پاشایەتییەكان لە ئەورووپادا دادەنێ. ئەو لە بەرهەمە بەناوبانگەكەیدا (فەرمانڕەوا ) دەنووسێ:

*تاکە کەسێك بەسەر وڵاتی تورکدا زاڵە و ئەوانی دیکە هەموو بەندەی ئەون، ئەو وڵاتەکەی بە چەند میرنشین[5] دابەش کردووە و فەرمانڕەوایەك بۆ هەر کامیان دەنێرێ و بە ئارەزووی خۆی لایان دەبا و دایان دەنێ [...] ئەمانە بەندەی ملکەچی خۆیانن.[6]*

لەجێگایەکی دیکە لە هەمان سەرچاوەدا دەڵێ:

*ئەمڕۆ بێجگە لە فەرمانڕەوای تورك و سوڵتانی میسر، ئەرکی هەر فەرمانڕەوایەکە کە پتر بەدوای ڕەزامەندیی خەڵکەوە بێت تا ڕەزامەندیی لەشکرییەکان، چونکە جەماوەر کاریان زیاتر لە دەست دێت تاکو لەشکرییەکان. ترکەکان بۆیە هەڵدەوێرین، چونکە فرمانڕەواکەیان سپایەکی لە دوازدە هەزار پیادە و پازدەهەزار سوارە پێکهێناوە کە ئاسایش و دەسەڵاتی پاشا بەوان پشت ئەستوورە. هەر بۆیە پاشای تورك دەبێ بەر لە هەرشت، ویستی دڵی ئەوان بەجێ بێنێ. سەبارەت بە سوڵتانی میسریش هەروایە کە پاشایەتییەکەی بە لەشکر پشت ئەستوورە و دەبێ بە پشتگوێ خستنی خەڵك، دڵی ئەوان بە دەست بێنێ و دەبێ ئەمەش بڵێین کە ئەم پاشایەتییە لەگەڵ پاشایەتی وڵاتانی دیکە وەك یەك نییە و زۆرتر لە حکوومەتی پاپا دەچێ، چونکە نە دەکرێ بە پاشایەتییەکی میراتی دابنرێ و نە پاشایەتییەکی نوێ بێ، لەو وڵاتەدا ڕۆڵەکانی پاشای پێشوو نابنە پاشا، بەڵکوو کەسانێکی دیکە کە شایانی پاشایەتین، بۆ ئەم پۆستە هەڵدەبژێردرێن.[7]*

توێژەرانی هزری سیاسی لەو بڕوایەدان کە بۆچوونەکانی ماکیاڤیلی لەسەر جیاوازیی ماهییەتی حکوومەتی عوسمانی لەگەڵ حکوومەتە ئەورووپییە



سەرەتاییەکان، یەکەمین هەوڵە بۆ پێناسەی شوناسی «ئەورووپی» و دەستنیشان کردنی لایەنە جیاوازەکانی لە «نائەورووپی» یەکان، شەست ساڵ پاش ماکیاڤیلی، بۆدەن[8]" ١٥٣٠-١٥٩٦ فەیلەسوفی سیاسی و کۆمەڵایەتی فەڕانسی، لەسەر و بەندی جەنگە ئایینییەکانی فەڕانسەدا خاڵی جیاکەرەوەی حکوومەتە ئەورووپییەکان لەگەڵ حکوومەتی عوسمانی لەوەدا دەبینی کە لەیەکەمیاندا ئابڕووی کەسەکان ڕێزی لێدەگیرێ و سامان و داراییان دەپارێزرێ، کەچی لە دووەمیاندا سوڵتان دەسەڵاتی بە سەر گیان و ماڵی ژێردەستەکانیدا هەیە و سنووری بۆ نییە.

*فرانسیس بیکۆن* (فەیلەسوف و کەسایەتی بەریتانی؛ ١٥٦١-١٦٢٤)یش جیاوازیی سەرەکیی حکوومەتی عوسمانی لەگەڵ حکوومەتە ئەورووپییەکاندا لە نەبوونی چینی نەجیب زادەکان لە حکوومەتی عوسمانیدا دەزانی و پێی وابوو کە لە هەرجێگایەك چینی نەجیب زادەکان لە ئارادا نەبێت کە پێش بە دەست درێژییەکانی فەرمانڕەوا بۆ سەر گیان و ماڵی ژێردەستەکانی بگرێت، لەو جێگایە حکوومەت زاڵم[9] دەبێت، بەڵام جی.هارینگتۆن[10] ؛١٦١١-١٦٧٧ کۆماریخواز و تیۆریزانی سیاسی بەریتانی، یەکەمین توێژەر بوو کە لەسەر جیاوازیی نێوان بنەما ئابوورییەکانی حکوومەتی عوسمانیی و حکوومەتە ئەورروپاییەکان پێی داگرت، چونکە پێیوابوو کە لەتورکیای عوسمانیدا هیچکەس بێجگە لە سوڵتان مافی خاوەنێتیی زەوی نییە. *بێرنییە*[11] پزشکی فەرانسی کە بە سەفەر چووبووە تورکیا و ئێران وهیندستان و ببوو بە پزیشکی تایبەتی «ئەورەنگی زەیب» و فەرمانڕەوای هیندستانیش، ئەم تایبەتمەندییانەی

نەتەنیا بۆ حکوومەتی عوسمانی، بەڵکوو دەیخستنە پاڵ حکوومەتەکانی هیندو ئێرانیش، وەسف و تێبینییەکانی بێرنییە لە وڵاتانی ئاسیاییدا کاریگەرییەکی قووڵیان لەسەر هزرڤانانی چاخی رۆشنگەریی و بەتایبەتی لە سەر مۆنتسکیۆ(١٦٨٩-١٧٥٥)هەبووە. *پی. بەیل*[١٢]؛ ١٦٤٧-١٧٠٦ فەیلەسووفی فەرەنسی و پێشەنگی رۆشنگەریی، بۆ یەکەمین جار لەساڵی ١٧٥٦ دا وشەی «سەرەڕۆیی» بە واتا ئەمڕۆییەکەی بەکار هێنا.

لە سەرەتاکانی سەدەی هەژدەیەمدا مۆنتسکیۆ لەکاتی وەسف کردنی حکوومەتی تورکیادا چەند تایبەتمەندییەکی بۆ ئەو حکوومەتە دەستنیشان کرد کە بێرنییە بۆ حکوومەتە ئاسیاییەکانی دیاری کردبوو، بۆ نموونە مۆنتسکیۆ لە کتێبی رۆحی یاساکاندا، (کتێبی پێنجەم، بەشی چوارەم)دا دەنووسێ:

لە توورکیا سوڵتان بەوەرگرتنی سێ لە سەدای میراتی کۆچکردوو رازی دەبێ. ئەو زۆربەی مڵکەکان بەشێوەی (ئیقتاع) دەدا بە لەشکرییەکانی خۆی، واتە هەردەم بیهەوێ دەتوانێ وەریان گرێتەوە. هەموو سامانی فەرمانڕەواکان لە سەرانسەری ئیمپراتوریدا دوای مەرگیان دەبێتەماڵی سوڵتان؛ هەر کەسێك منداڵی نێرینەی نەبێت سوڵتان دەبێتە میراتگری، چونکە کچەکانی کۆچکردوو تەنیا مافی سوود وەرگرتنیان لە دارایی بابیان هەیە، نەك مافی خاوەنێتیی داراییەکەی.[...]لە نێو حکوومەتە سەرەرۆکاندا لە هەموان خراپتر ئەو حکومەتەیە کە سوڵتان خۆی بە خاوەنی هەموو ژێر دەستەکانی و میراتگری هەموان بزانێ کە بە هۆیەوە، وەرزێریی و



کێڵانی زەویەکان کوێر دەبێتەوە وئەگەرسوڵتان دەست لە بازرگانیش وەربدا، ئەمەش دەبێتە مایەی لەناوچوونی هەموو جۆرە پیشەیەك.

مۆنتسکیۆ لە(رۆحی یاساکان)دا بۆ یەکەمین جار تیۆرییەکی بەراوردکاری لەبارەی ئەو شتە ئاراستە دەکات کە بە «سەرەڕۆیی» ناو دەنێ و وەك شێوەیەك لە حکوومەتی نائەورووپی دەیناسێنێ کە لە بەرانبەر «فیۆدالیزم »ی ئەورووپیدا رادەوەستێ. ئەو لە «رۆحی یاساکان» ،کتێبی هەڤدەیەمدا دەنووسێ:

*ئاسیا هەمیشە ئیمپراتۆریەتی مەزنی هەبووە. لە ئەورووپادا دەرەتانی پەیدابوونی ئەو ئیمپراتۆرییەتانە نەبووە[...] هەربۆیە لەئاسیادا دەسەڵاتی سیاسی بەردەوام دەبێ سەرەڕۆیانە بێت، چونکە ئەگەر کۆتی کۆیلەتی بەهێز نەبێت، ئیمپراتۆری پارچە پارچە دەبێ و ئەمەش لەگەڵ سروشتی جوگرافیایی وڵاتانی ئاسیاییدا نایەتەوە. بەپێچەوانەوە، دابەشکردنە جوگرافیاییەکانی ئەورووپا بوونەتە هۆی ئەوەی وڵاتانی ئەم بەشە لە سەر زەوی پانتایەکی مامناوەندییان هەبێ. هەر بۆیە حکوومەتی پشت ئەستور بە یاساکان، نەتەنیا لەگەڵ بەردەوامی و مانەوەی وڵاتانی ئەورووپی ناتەبا نییە، بەڵکو وەها لەگەڵ مەزاجیان رێك دەکەوێ کە بەبێ یاسا ئەم دەوڵەتانە بە لێژایی هەرەسدا شۆڕدەبنەوە و دەبنە پارووی دراوسێکانی خۆیان. ئەم تایبەتمەندییە بۆتە مایەی پەیدا بوونی مەیلی ئازادی. هەربۆیە ملکەچبوونی هەربەشێك لە خاکی ئەورووپا بۆ وڵاتێکی بیانی زۆر ئەستەمە، تەنیا یاسا و بەرژەوەندییە ئابوورییەکان دەتوانن بەشێك لە ئەورووپا ملکەچی وڵاتێکی دیکە بکەن، بە پێچەوانەوە لە ئاسیادا رۆحی کۆیلەتی و بەندەیی زاڵە و نەتەوەکانی ئاسیا*

*هیچکات نەیانتوانیوە کۆتی کۆیلەتی لە ئەستۆ دارنن. لەمێژووی ئەواندا شتێك بێجگە لەبەندەیی و کۆیلەتی نییە.*

مۆنتسکیۆ کە بۆچوونی *بۆدەن* و *بێرنیە* زۆری کارتێکردبوو پتر لە هەر کەسێکی دیکە چەمکی سەرەڕۆیی رۆژهەڵاتی برەو پێدا. لێرەدا باشتر وایە قەڵەم بسپێرین بە *لۆوی ئالتۆسێر* (فەیلەسووفی فەڕانسی؛ ١٩١٨ـ١٩٨٩ )تا ئەویش بۆچوونەکانی مۆنتسکیۆ بە شێوەیەکی تایبەت بگێڕێتەوە:

*یەکەمین تایبەتمەندی سەرەڕۆیی ئەمەیە کە رژێمێکی سیاسی بێ پێکهاتەیە! نە پێکهاتەی سیاسی ـ قەزایی هەیە و نە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی. مۆنتسکیۆ زۆر جاران دەڵێ کە سەرەڕۆیی بێ یاسایە، کە بێ شك مەبەستی ئەو بەر لە هەموو شت یاسا بنچینەییەکانە[١٣]، بەڵام مۆنتسکیۆ ئەمەش دەڵێ کە سەرەڕۆیی هەموو دەسەڵاتی دەبەخشێ بە سەرۆك وەزیران، (کتێبی دووەم، بەشی پێنجەم). کە ئەم گوێزانەوەیەی دەسەڵات بەرواڵەت یاسای سیاسییە؛ بەڵام لە راستیدا یاسای مەیلی دەروونییە(یاسای دەروونزانییە کە خووی دڕندانەی سەرەڕۆ پیشان دەدات). ئەم یاسا فێڵاوییە کە بە نارەوایی مەیلی دەروونی دەکات بە سیاسەت، دربڕی ئەم خاڵەیە کە لە حکوومەتی سەرەڕۆییدا، بەردەوام دەکرێ تەواوەتی سیاسەت بەهەوا و مەیلی دەروونی بگۆڕێتەوە. هێشتا پێکهاتەیەك لە ئارادا نییە. ئەگەرچی لە حکوومەتی سەرەڕۆدا دین دەوری سەرەکی[١٤] دەگێڕێ و دەبێتە سەرچاوەیەك لە سەرووی سەرچاوەی سیاسییەوە و لە هێندێ بواریشدا دەبێتە مایەی نیشتنەوەی بێبەزەیی سوڵتان و هەمیش تارادەیەك ترسی ژێردەستەکانی کەم دەکاتەوە، سەرەڕای ئەمانەش ناوەرۆکی ئەمەیان سۆزە،*



*چونکە لە رژێمی سەرەڕۆدا دین بۆخۆشی سەرەڕۆیە و ترسێکە کە لە سەر ترسەکانی پێشوو کەڵەکە دەبێ(رۆحی یاساکان، کتێبی پێنجەم، بەشی چوارەم).*

هەر بۆیە نە لە وەزارەتدا و نە لە دیندا، شتێکی وەك هەلومەرجی سیستمێکی سیاسی یان سیستمێکی دادوەری لە ئارادا نییە کە لە سۆزەکانی مرۆڤ سەرتر بڕوا. لە راستیدا سەرەڕۆیی هیچ یاسایەك بۆ بەڕێوەبردن ناناسێ. واتە لە روانگەی سەرەڕۆوە شتێك لەنێواندا نییە کە سبەینێی ئەو و دوێنێی ژێردەستەکانی پێکەوە گرێ بدات. سەرەڕۆیی تەنانەت فرمانی دڵخوازی سەرەڕۆ خۆشی وەرناگرێ. فرمانێك کە دەتوانێ بەشۆڕشێك لە کۆشکی سوڵتان، یان پیلانێك لە حەرەمخانەی وی، یان بە راپەڕینێکی گشتی، پوچەڵ کرێتەوە. سەرەڕۆیی هیچ یاسایەکی سیاسی ناناسێ، بێجگە لە یاسایەك کە بۆ گوێزانەوەی سەیر و سەمەرەی دەسەڵاتی سوڵتان رەوایە و ئەم دەسەڵاتە بەردەوام دەسەڵاتێکی رەهایە، ئەم دەسەڵاتە رەهایەش لە خودی سوڵتانەوە دەست پێدەکات و دەگات بە سەرۆکی هەر خانەدانێك لە هەموو گۆشە و کەناری وڵات. مەنتیقی هەوا و مەیلی دەروونی لە رێگەی سەرۆك وەزیران، میرەکان و فەرماندار(قایمقام)ەکانەوە لە سەرانسەری دەسەڵاتی سەرەڕۆدا بڵاەو دەبێتەوە.

ئەم مەنتیقی مەیلی دەروونییە لە لایەك تەوەزەلییە و لەلایەکی دیکەشەوە چێژوەرگرتن لە دەسەڵاتدارێتییە بە سەر خەڵکەوە. سەرەڕۆیی بێبەرییە لە یاسای دادوەری، یەکەمین یاسای دادوەر لە کاتی دادگاییدا خوو و خدەی ئەوە و تەنیا میتۆدی دادوەریش تورەیی و تۆسنیەتی. دادوەر کە

هێشتا قسەی لایەنەکانی کێشەکەی بە جوانی گوێ نەداوەتێ، بڕیاری خۆی دەدا و فەرمان دەدات کە هەرلەوێ یان مەحکووم لە دار بدەن یان سەری پەل دەن، لە ئاکامدا ئەم رژێمە سەیر و سەمەرەیە بە پێکەوەنانی کەمترین هێزی لەشکری کە رەنگبێ کاروباری ئاڵوگۆڕی بازرگانی رێك بخەن، خۆی تووشی سەرێشە ناکات.لە رژێمی سەرەڕۆدا تەنانەت یاساکان لە رووی نائاگاییشەوە بەسەر«کۆمەڵەی پێویستییەکان»کە پێکهێنەری بازاڕی ئابوورییە، حکوومەت ناکەن، واتە سیستمێکی ئابووری کە لە ژیانی رۆژانە و کردارییی ئەوان سەرووتر بچێ، لە ئارادا نییە. لە وەها رژێمێکدا مەنتیقی ئابووری بێ مەنتیقییە، مەنتیقی ئابوورییش بەرەو مەیلی کەسەکان دادەکشێ، ژیانی بازرگان تەنیا لەمرۆوە دەکەوێتە سبەی، چونکە بەردەوام ئەو ترسە لە دڵیاندایە کە نەکا ئەوەی ئەمرۆ کۆی کردۆتەوە، سبەی لێی بستێنن. بازرگان لە رژیمی سەرەڕۆدا وەك مرۆڤی دڕندەیە لە کیشوەری ئەمریکادا، کە «*ژانژاك رۆسۆ*» باسی کردووە، ئەم دڕندەیە ئەو جێوبانەی دوێشەو تێیدا خەوتووە، دەیفرۆشێ بێ ئەوەی بیر لەم شەوی بکاتەوە.[...] سەرەڕۆیی، یاسای سیاسی و دادوەریی نییە، نەرابردووی دێتەوە یاد و نە لە بیری داهاتوو دایە، رژێمێکە کە تەنیا لە چرکە ساتدا کات رادەبوێرێ. ئەم ناسەقامگیرییە، بێ پێکهاتەیی کۆمەڵایەتی دەبپارێزێ و گەرەنتی دەکات. لە دیموکراسیدا دادوەرەکان خاوەنی پێڕەوی ناوخۆ و ستاتۆن[١٥] و ماڵ و پلە و پایەیان هەیە و یاساش پشتی دەوڵەمەند بوون دەگرێ. لە ئەورووپادا حکوومەتە پاشایەتییەکان تایبەتمەندی نەجیبزادە و پیاوە ئاینییەکانیان بە رەسمی ناسیوە، بەڵام لە حکوومەتی سەرەڕۆدا هیچ تایبەتییەك نییە کە تاکەکان لە



یەکتر هەڵاوێرێ. سەرەڕۆیی هەرێمی یەکسانییەکی بێ لغاوە، چونکە لەژێر دەسەڵاتی سەرەڕۆیانەدا هەموو هاووڵاتییان لە یەك ئاست و پلەدان. (رۆحی یاساکان، کتێبی پێنجەم، بەشی چواردەیەم) لێرەدا مۆنتسکیۆ دەڵێ کە لەحکوومەتی سەرەڕۆ هەمووکەسەکان یەکسانن بەڵام نەك لەبەر ئەوەی کە کەرامەت و رەوشتی مرۆڤانەیان هەیە، واتە وەك ئەو دۆخەی کە مرۆڤەکان لە دیموکراسیدا هەیانە، بەڵکوو تاکەکان بۆیە لە حکوومەتی سەرەڕۆدا یەکسانن، چونکە هەموویان بە هیچ و بە سووکی سەیر دەکرێن (رۆحی یاساکان، کتێبی شەشەم، بەشی دووەم). ئەم یەکسانییە بەهۆی سەرکوتی هەموو پلە کۆمەڵایەتییەکان و هاوئاستکردنی کەسەکانەوە دانراوە. ئەم رژێمە بە زەبر و زەنگە نە رێز لە پێگەی میراتیی تاکەکان دەگرێ ونە پلەی نەجیبزادەییان لە بەر چاو دەگرێ. سەرەڕۆیی هەبوونی خانەدانە رەسەنەکانی بۆ قوت ناچێ و پیاوی دەوڵەمەندیش بە هێند ناگرێ. سەرەڕۆ تاقەتی مانەوەی «خانەدانەکان»ی نییە کە لە درێژایی سەردەم و قۆناغەکان ماڵیان کۆکردۆتەوە و ناتوانێ سەرکەوتنی ئەو نەوانەش ببیسێ کە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییان گەشاندووەتەوە. سەرەڕۆ ناتوانێ تەنانەت پێگە و مەقامێکیش پەسند بکات کە بۆ خۆی بە ژێر دەستەکانی بەخشیوە. ئەگەرچی سەرەنجام پێویستیی بە وەزیر، فەرماندار و میرو دادوەرەکان دەبێ، بەڵام ئەم پلەو پایەیەش تەنیا بە هەڵکەوت و کاتین و هەرکە وەختی لەسەرکار لابردنیان گەیشت، دەبنەوە هیچ. هەر میرزا بنووسێکی، رەنگە هەموو دەسەڵاتەکەی سەرەڕۆ بگرێتە دەست، بەڵام ژیانەکەی، ژیانی غەزەب لێگیراوێکە کە کەوتنەبەر غەزەبەکەی وەدوایە کەوتووە. یان وەك کەسێکی مەحکووم بە

سێدارە وایە کە بەڕێوەچوونی حوکمی سێدارەکەی بە هەڵواسراوی ماوەتەوە، هەموو ئازادییەکانی وەها کەسێك هەر ئەمەیە، تەواوی ئاسایشی ئەمەیە، لەحکوومەتی سەرەڕۆدا هیچ کەس لە گیان و ماڵی خۆی ئەمین نییە. مۆنتسکیودەڵێ: بە چێشت لێنەربوونی سوڵتانێك چەندە سانایە، بەسوڵتان بوونی چێشت لێنەرێکیش هەروایە (ڕۆحی یاساکان، کتێبی پێنجەم، بەش نوزدەیەم). [...]تەنانەت ئەو دەزگایەی کە بۆ وەدیهێنانی نەزم، ترس و خورپەی جەماوەر ئەو هەمووە پێویستە (واتە لەشکر)، لەم جۆرە حکوومەتەدا جێی بۆ نییە، چونکە لەشکر دەزگایەکی زۆر سەقامگیرە و بۆ شێوانی بارودۆخی گشتی کە سیمای سەرەکی حکوومەتێکی سەرەڕۆیە، زۆر مەترسیدارە. شتێکی زۆر پێویست بۆ حکوومەت پاسەوانە تایبەتییەکانن کە سەر بە سوڵتان خۆین و بانگیان دەکات و لە تاریکی کۆشکدا ڕایاندەگرێت.[...] لەوەها ڕژێمێکدا شتێك لە ئارادانییە کە مرۆڤەکان لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە لەیەکتر بەجیا دابنێ یان نیشانێکی لە پلەو پێگە کۆمەڵایەتییەکانیان پێوە بێت. هیچ جۆرە ڕێکخراوێکی کۆمەڵایەتی لە ئارادانییە کە میراتگرەکان بۆ ڕێی داهاتوو ڕێبەری بکات و پێگە و پایەی کۆمەڵایەتییان بپارێزێ، هەروەك چۆن سەرەڕۆیی بێ پێکهاتەی سیاسی و دادوەرییە، هەر بەو جۆرەش بێ پێکهاتەی کۆمەڵایەتییە.

هەر ئەم تایبەتمەندییە بە مان و بوونی ئەم ڕێژیمە ڕەنگ و ڕوویەکی نامۆ دەبەخشێ. هەرچەندە حکوومەتی سەرەڕۆ بەسەر کەشوهەوایەکی بەریندا حوکم دەکات، بەڵام بەواتایەك لە هەبوونی هەر جۆرە کەش و هەوایەکی



کۆمەڵایەتی بێبەشە. بۆ نموونە ئەم جۆرە ڕژێمە لەچین بەهەزاران ساڵ بەردەوام هەبووە، بەڵام بەجۆرێك کە دەڵێی بێبەشە لەماوە و کات[١٦].

«کەش»ی کۆمەڵاتی و «کات»ی سیاسی ڕژێمی سەرەڕۆ وەك یەك بۆش و پوچەڵن. واتە کەشێکی بێ شوێن و کاتێکی بێ ماوەیە. مۆنتسکیۆ دەڵێ کە پاشاکانی ئەوروپا جیاوازی نێوان پارێزگاکان دەزانن و بایەخیان بۆ دادەنێن، بەڵام سەرەڕۆیی ڕۆژهەڵاتی نەتەنیا ئەم جۆرە جیاوازییانە درك پێ ناکا، بەڵکو کاتێ بیانناسێ هەوڵی لەناوبردنیشیان دەدا. سەرەڕۆ تەنیا بەسەر یەکسانییەکی بەتاڵ و بەسەر بۆشاییەکدا حکوم دەکات کە لەبێ متمانەیی بە دواڕۆژەوە سەری هەڵداوە. ئەو بەسەر زەوییە بەیارەکان و بازرگانییەکی لەبارچوو و پێدەشتە ویشکارۆکاندا حکوم دەکات. سەرەڕۆ ئەم ویشکارۆیانە وەك سنووری نێوان خۆی و وڵاتانی دراوسێی دیاری دەکات، بۆ ئەم مەبەستە زەوییەکان، تەنانەت زەوی ژێر بازنەی دەسەڵاتی خۆشی دەسووتێنێ، تاکو لە بەرانبەر پەتا تەشەناکەرەکان و هێرشی گەلانی بیانیدا لەئەماندا بێت، چونکە تەنیا ڕێگەی ڕزگاربوونی خۆی هەر لەمەدا دەزانێ (ڕۆحی یاساکان، کتێبی نۆیەم، بەشەکانی چوارەم و شەشەم).

بەڵام کات لە ڕوانگەی سەرەڕۆوە، خاڵی بەرانبەری ماوەیە: واتە تەنیا چرکەساتە، سەرەڕۆیی نە تەنیا بێ دامەزراوە و پلە کۆمەڵایەتییەکان و ئەو خانەدانانەیە کە لەکاتدا بەردەوامن، بەڵکوخودی کردارەکانی ڕژێمیش لە یەك چرکەساتدا دەردەکەون. سەرەڕۆ لەجیهانی خەیاڵی خۆیدایە. ئەو بێ ئەوەی بیر بکاتەوە، بەڵگە هاوڕا و دژەکان هەڵدەسەنگێنێ، بەبێ ئەوەی کە «ناوبژیکارانێك » لە ئارادابن، بەبێ ئەوەی لە بڕیارەکانیدا «سنوورەکان»

ڕەچاو بکا، تەنیا لە چرکەساتدا بڕیار دەدات. (ڕۆحی یاسان، کتێبی سێیەم ،بەشی دەیەم )، چونکە بیرکردنەوە، کات دەبا و پێویستی بە بیرۆکەیەك بۆ داهاتوو هەیە. بەڵام سەرەڕۆ هیچ بیرێکی لەبارەی داهاتووەوە لەو بازرگانە زیاتر نییە کە قازانجی پێدەگا تائەمڕۆی خۆی بگەیەنێتە سبەی. هەموو ڕامان و بیرکردنەوەکانی سەرەڕۆ بە بڕیاردانێکی چرکەساتانە کۆتایی دێت و خێڵی مەزنی کاربەدەستانی ساتییانەی ئەو هەر ئەم بڕیاردانە کاڵ و خاوە دەگوازنەوە بۆ گۆشە و کەناری وڵات. لە ڕاستیدا ئەوان دەتوانن چ بڕیارێك بدەن؟ ئەوان بەڵگەکانی سەرەڕۆ سەبارەت بە دانی ئەو بڕیارانە نازانن. بێجگە لەمە مەگەر سەرەڕۆ بۆ خۆشی لەکاتی دانی ئەو بڕیارانەدا بەڵگەیەکی هەبووە؟ کاربەدەستان دەبێ بڕیار بدەن! هەر بۆیە ئەوانیش «شێوەی بڕیاردانی کتوپڕ» ڕەچاو دەکەن، هەروەك چۆن ئەوان بەشێوەی «کتوپڕ» دەکەونە بەر قین، یان دەکوژرێن.

(ڕۆحی) کاربەدەستان دەڵێی لە هەموو بوارێکەوە لەو دۆخەدان کە فەرمانڕەواکەیان تێیدایە. فەرمانڕەوایەك تەنیا لە ڕێی مەرگەوە لە داهاتووی خۆی ئاگادار دەبێت، ئەویش بەو مەرجەی کە هەر ئێستا لە سەرەمەرگدا نەبێ، سەرەڕای هەموو ئەمانەش، ئەم مەنتییقی کتوپڕییە تۆخە، هەقیقەت و ناوەرۆکێکی هەیە.[...]ژینی ڕژێمی سەرەڕۆ، ژینی هەوەس و تۆسنێتی چرکەساتانەیە. ڕەنگبێ ئەم بابەتە بەشێوەی پێویست درك پێنەکرابێ کە لە تیۆری مۆنتسکیۆ دا ئەو سۆزە بەناوبانگانەی کە بنەمای حکوومەتە جۆراوجۆرەکان پێکدێنن، هەموو لە ڕەچەڵەکێك نین. بۆ نموونە شەرەف، سۆزێکی ساکارنییە (یان باشترە بگۆترێ) سۆزێکی



«دەروونزانی» نییە. هەرچەندە شەرەف وەکو سۆزەکانی دیکە دەم دەمییە، بەڵام دەمدەمی بوونەکەی بە یاسایە واتە یاسا وڕێسای خۆی هەیە، بۆ مۆنتسکیۆ هێندە دژوار نەبووە کە بزانێ لە ئەوروپادا زاتی پاشایەتی نافەرمانییە، بەڵام ئەم نافەرمانییە بەپێی *ڕێسا* دەکرێ. بەم جۆرە شەرەف تەنانەت لە شێوەی سەرپێچیکردن و نافەرمانیشدا سۆزێکە لەسەر بنەمای ڕامان و بیرکردنەوە. ئەگەرچی شەرەف «دەروونی» و ناڕاستەوخۆ بێت، سەرەڕای ئەمەش، سۆزێکە کە کۆمەڵ تاڕادەیەکی زۆرباش پەروەردەی کردووە. شەرەف سۆزێکی *کولتووری* و *کۆمەڵایەتییە*.

ئەم باسە لەبارەی سۆزێکیشەوە ڕاست دێتەوە کە بنەمای حکوومەتی کۆمارییە. ئەمەش سۆزێکی سەیرە و تاك بەرانبەر بەوە هەستی ناڕاستەخۆی نییە، بەڵکو ئەم سۆزە ئاواتەکانی ئەو دەکاتە قوربانی تا بەرژەوەندی گشتی وەك ئامانجی ژیانی پێ ببەخشێ. ئەخلاق وەك سۆزێکی بەخێر بۆ جەماوەر پێناسە دەکەن[...]، ئەخلاقیش وەك شەرەف، یاساو ڕێسای خۆی هەیە، یان وردتر بڵێین یاسای تایبەت بەخۆی هەیە، واتە یاسای ئەوین بە نیشتمانی باوك. ئەو سۆزە کە خەسڵەتی بابەتێکی گشتی بەخۆ گرتووە، پێویستی بە فێرکردنێکی گشتی هەیە. ڕێبازێکی کە تاك دەتوانێ ئەم وانەیەی تێدا وەبینێ کە هەموو تەمەنی دەگرێتەوە. ئەم پرسیارە لەمێژینەیەی سوقرات کە ئاخۆ دەکرێ فێری ئەخلاق بی؟ مۆنتسکیۆ بەمجۆرە وەڵامی دەداتەوە کە ئەخلاق دەبێ فێری بی و چارەنووسی ئەخلاق لە ڕاستیدا بەمەوە گرێ دراوە، بەڵام سۆزێکی کە سەرەڕۆ لەسەر پێ ڕادەگرێ، بەمجۆرە نییە، ترس بۆ فێربوون نابێت. هەربۆیە لە حکوومەتی سەرەڕۆ پەروەردە و فێرکردن «تاڕادەیەك

چرووکن» (رۆحی یاساکان، کتێبی چوارەم، بەشی سێیەم). ترس نەسۆزێکی لێکدراوە و نە سۆزێکی مەعریفییە، ترسە، نەیاسادەناسێ و نەرێسا. ترس سۆزێکە کە نە پێشینەی هەیە نە نازناو. ترس سۆزێکی سانایە کە بەردەوام خۆی چەندپایە دەکاتەوە. لەنێوان سۆزە «سیاسی» یەکاندا ترس تەنیا سۆزێکە کە سیاسی نییە، بەڵکو «دەروونی» یە، چونکە سۆزێکی ناڕاستەخۆ و چرکە ئاسایە. بەم وەسف کردنە، ترس سۆزێکە بنەمای ژینی ڕژێمێکی سەیر و سەمەرە و سەرەڕۆ پێکدێنێ.

ئەگەر سەرەڕۆ کاروباری حکوومەت بەهۆی تەمبەڵی و بێتاقەتی بدا بە کەسێکی دیکە، بۆیە دەیداتێ کە ئەو ناخوازێ کەسێك بێت لەبەر چاوی هاووڵاتیان دەرکەوێ و ناخوازێ وەك کەسێکی دیار و بەرچاو بێت کە بۆ پلەوپایەیەك پێویستە. هێزی هەوەس یان بێ تاقەتیی سەرەڕۆ، بە لکوپۆی شکۆوە دادەپۆشرێ. سەرەڕۆ خۆی لە بەڵای کەوتنە بەرچاوی جەماوەر ڕزگار دەکات و تواناکانی خۆی دەدا بە کەسێکی دیکە کە خۆی بە چێژە هەوەساوییەکانی خۆی بسپێرێ. سەرەڕۆ شتێکی بێجگە لە هەواو مەیلە دەروونییەکانی خۆی نییە. هەربۆیە بەرەو دیوەخان ڕادەکا. کەواتە زۆر سەیر نییە کە ببینین هەر ئەم مودێلە لە هەموو پیاوانی سەر بە ئیمپراتۆرین بەشێوەیەکی بەربڵاو چەند پات دەبێتەوە. بچووکترین فەرمانبەریش لانی کەم بەسەر ژنانی خۆیدا ملهوڕی دەکات و لە هەمان کاتیشدا لە بەندیخانەی ئەواندایە، چونکە ئەوە مەیلە جنسییەکانێتی کە پاڵی پێوەدەنێ. ئەم بابەتە دەریدەخات کە لە حکوومەتی سەرەڕۆ تاقانە ویستێکی کە دەمێنێتەوە، ویستی «پێویستییەکانی ژیان»ە. مونتسکیۆ دەڵێ کە سەرەڕۆیی،



حکوومەتی «بەرژەوەندی تایبەتی»یە. (رۆحی یاساکان، کتێبی نۆیەم، بەشی شەشەم). هەوەسیش ماوە و بەردەوامی نییە تاکو بتوانێ بۆ خۆی داهاتوویەك دروست بکات. سەرەڕۆیی ئەوەندەی لە ترسەوە دێ، بە هەمان ڕادە لە هەوەسیشەوە سەرچاوە دەگرێت.(١٧)

تیۆریی مۆنتسکیۆ لە بارەی «سەرەڕۆیی ڕۆژهەڵاتی»یەوە (ئەگەر ڕوانگەی چەند ڕەخنەگرێك لەبەر چاو نەگرین) گشتگیر بووە و بۆ فەلسەفە و بۆ ئابووریی سیاسیش بووەتە میراتێکی بەنرخ. لەم پێناوەدا هەنگاوی دواتر ئادەم سمیت فەیلەسووف و ئابووریزانی سکۆتلەندی (١٧٢٣ ــــ ١٧٩٠ ) هەڵیگرت. ئەو بۆ یەکەمین جار ئەوروپا و ئاسیای لەبواری زانستەجۆراوجۆرەکانی بەرهەمهێنانی ئابووریدا لەبەرانبەر یەکتر دانا. ئادەم سمیت لەکتێبە بەناوبانگەکەی (سامانی نەتەوەکان)دا دەنووسێ:

هەروەك چۆن ئابووری سیاسی نەتەوە ئەوروپییە پێشکەوتووەکان پتر ڕێخۆشکەری بەرهەمهێنانی پیشەسازیی و بازرگانی دەرەکی و گەشەی پیشەسازییەکان لە شارەکاندا بووە نەك ئەوەی کە ڕێخۆشکەری وەرزێڕی و پیشە دەسکرد و گوندییەکان بێت، بەهەمان شێوە نەتەوەکانی دیکەش پرۆگرامی جیاوازیان ڕەچاو کردووە. ئابووری ئەوان پتر بۆ کشتوکاڵ لەبار بووە تا پیشەسازی و بازرگانی دەرەکی. سیاسەتی چین کاری کشتوکاڵ دەخاتە پێش پیشەکانی ترەوە، دەڵێن لە چین، بە پێچەوانەی ئەورووپا، باری جوتیاران لە پیشەگەران زۆرباشترە.(١٨)

هیگڵ (فەیلەسووفی ئەڵمانی "١٧٧٠ ـــ ١٨٤٠) یش لە بارەی «سەرەڕۆیی ڕۆژهەڵاتی»یەوە چەند بۆچوونێکی نوێی ئاراستەکردووە. ئەو

بەرهەمەکانی مۆنتسکیۆ و ئادەم سمیتی بەوردی خوێندۆتەوە و چەمکەکانی مۆنتسکیۆی لەبارەی «سەرەڕۆیی ڕۆژهەلاّتی»یەوە لە چوارچێوەی زاراوە تایبەتییەکانی خۆیدا داڕشتۆتەوە. هیگڵ لەوانەکانی خۆیدا سەبارەت بە فەلسەفەی مێژوو دەڵێ: «چین، ئێران، تورکیا و بەگشتی ئاسیا، ولاّتی سەرەڕۆیانەیە. ئاسیا بۆتە گۆڕەپانی خوو خدەی دزێوی ڕژێمە ستەمکارەکان[19]».[20]

مۆنتسکیۆ لە ڕۆحی یاساکان، (کتێبی چواردەیەم ،بەشی چوارەم) دا دەڵێ: ئەندامە هەستییی(حسی)ەکانی گەلانی ڕۆژهەلاّت بەرانبەر بە وەرگرتنی کاریگەرییە هەستییەکان زۆر هەستیارن. ئەگەر بەم هەستیارێتییەیان جۆرە تەمبەڵییەکی هۆشەکی (زەینی) زیاد بکەین کە بە شێوەیەکی سروشتی لەگەڵ جەستە (جسم) دا لە پێوەندیدایە، ئەو دەمە تێگەیشتنی ئەم بابەتە هاسان دەبێ کە لەبەرچی ئەم گەلانە لە هەوڵ و تەقەلای هۆشەکیدا داماون. کاتێ ڕۆحی ڕۆژهەلاّتی باوەڕ یان نەریتێکی پەسەند کرد، ئیتر ناتوانێ وەلای بنێ. هەر بۆیە لە ولاّتانی ئاسیاییدا یاسا، دابونەریت و تەنانەت ئەو شتانەی بە تەواوی شیاوی سەرنجدان نین، وەك شێوەی جلوبەرگ لەبەر کردن، بە هەمان شێوەی هەزار ساڵ بەر لە ئێستا ماونەتەوە.

هیگڵ ئەم ڕوانینەی مۆنتسکیۆ پەسند دەکا و کۆمەڵگە ئاسیاییەکان بە چەقیو دەزانێ. ئەو دەڵێ: «چین و هیند لەدۆخێکی چەقیودان و تەنانەت تا ئەم سەردەمەش ژیانیان بەشێوەی سروشتی و وەك گیا تێدەپەڕێ»[21].



هەروەها دەشڵێ: «لە ڕوانگەی هیندییەکی ئاسیاییەوە هەموو شۆڕشە سیاسییەکان بەکاری بێ بایەخ و نا پێویست دادەنرێن، چونکە چارەنووسی ئەو نەگۆڕە»[22].

هیگڵ جۆری حکوومەتە ئاسیاییەکان بەم شێوەیە وەسف دەکات:

«حکوومەتی ولاّتانی ئاسیایی دەکرێ بە تیۆکراسی وەسف بکرێت. خوا، فەرمانڕەوای سەر زەوییە و فەرمانڕەوای سەرزەویش خوایە. فەرمانڕەوا هاوکات هەردووکی ئەمانەیە. خوا [کە وەك فەرمانڕەوا ] بەرجەستە بووە، بەسەر حکوومەتدا فرمان دەدا، بەلاّم ئەم بنجە، سێ جیاوازی بەخۆ گرتووە کە تاوتوێیان دەکەین. ئیمپراتۆری چین و مەغۆلستان هەرێمی «سەرەڕۆیی تیوکراتی»یە. دەولّەت لە بنەڕەتدا باوك سالارییە. فەرمانڕەوا باوکێکە کە بەسەر لایەنە ویژدانییەکانی فەرمانبەرانی خۆیدا دەڕوانێ. تەنانەت کاروباری ئایینی و بنەماڵەش بە یاسا دەولّەتییەکان ڕێکدەخرێن و تاك هیچ جۆرە شوناسێکی ئەخلاقی [سەربەخۆی لە حکوومەتی تیۆکراتی] دا نییە»[23].

لە هیندستاندا (کاست)ەکان، ماف و ئەرکی هەمووکەس دیاری دەکەن و دەکرێ ئەم سیستمە وەك سیستمێکی ئەرستۆکراتیی تیۆکراتی وەسف بکرێت. لە ئێراندا شێوەی حکوومەت دەکرێ بە «پاشایەتی تیۆکراتی» پێناسە بکرێ.

مارکس و ئەنگلس[*] لەگەڵ بەرهەمەکانی ئەم هزرڤانانەی ئاماژەیان پێکرا، ئاشنا بوون و لە بەرهەمەکانی خۆیاندا نە تەنیا ڕاو بۆچوونی ئەوان پشتڕاست دەکەنەوە، بەڵکو بۆ سەرلەنوێ دەربڕینەوەشیان شێوازێکی توندتر هەڵدەبژێرن. مارکس لە وتارێکیدا لە ژێر ناوی: «ئەنجامەکانی فەرمانڕەوایی

ئینگلیز لە هیندستان»دا کە لە ڕۆژنامەی ***نیۆرك دەیلی تریبیون*** (ژمارە ٣٨٤٠، ٨ی ئابی ١٨٥٤)دا بلاوکراوەتەوە دەڵێ:

من لەم وتارەدا سەرنجەکانی خۆم لە بارەی هیندستانەوە کۆدەکەمەوە. هیند ولاتێکە کە نە تەنیا لەنێوان موسوڵمان و هیندووەکاندا، تەنانەت لەنێو ئەم هۆز و ئەو هۆز و ئەم کاست و ئەوکاستدا دابەش بووە.

چوارچێوەی ولاتی هیند بەپێی جۆرێك پارسەنگێتییە و ئەم پارسەنگێتییە لەبەر بێزاربوونی ئەندامەکانی بەرامبەر یەکتر و بەپێی یاسای کۆمەڵگای هیندستان بەدی هاتووە کە تاقانەیی ئەندامەکانی بەیەکەوە ڕەت دەکاتەوە. ئایا چارەنووسی وەها ولاتێك و وەها کۆمەڵگەیەك ئەمە نییە کە ژێردەستی کەسانی دیکە بێت؟ هەربۆیە هیندستان ناتوانێ لەم چارەنووسەی دەربازبێت کە ملکەچی ئەوانی تر نەبێت، هەموو مێژووی ڕابردووی، هەڵبەت ئەگەر مێژوویەکی هەبێت، مێژووی یەك لەدوای یەك داگیرکراویەتی. کۆمەڵگەی هیندستان بەهیچ جۆر مێژووی نییە، یان بەلای کەمی مێژوویەکی ناسراوی نییە. ئەوەی بە مێژووی هیندستان ناوی دەبەن، تەنیا و تەنیا مێژووی ئەو هێرشەبەرانەیە کە بەداوی یەکتردا هیندستانیان داگیرکردووە و ئیمپرتۆری خۆیان لەسەر ئەم کۆمەڵگە بێ بەرگری ونەگۆڕە دامەزراندووە. هەربۆیە پرسیار ئەمە نییە کە ئاخۆ ئینگلیز مافی ئەوەی هەبووە کە هیندستان داگیر بکات، بەڵکوو پرسیارەکە دەبێ ئەمە بێت کە ئاخۆ ئێمە پێمان باشە هیندستان لەلایەن تورکەکان، ئێرانییەکان و ڕووسەکانەوە داگیر کرابێ، یان ئینگلیزەکان؟



ئینگلستان لە هیندستان لێپرساوێتییەکی دوو لایەنەی هەیە. یەکیان وێران کردن و ئەوی دیکەیان سازکردنەوە. واتە لە جاری یەکەمدا دەبێت کۆمەڵگەی کۆنی ئاسیایی لە ناوبەرێ پاشان بنەما مادییەکانی کۆمەڵگەیەکی ڕۆژئاوایی لە ئاسیادا ڕۆبنێ.

عەرەبەکان، تورکەکان، تەتەرەکان و مەغۆلەکان کە بەدوای یەکدا هیندیان داگیرکرد، دوای ماوەیەکی کەم بۆ خۆیان بوون بە هیندستانی. بەپێی یاسای نەمری مێژوو، بەرەبەرە سەرکەوتووەکان بۆ خۆیان لە بەرامبەر ژیاری ژێردەستەکانی خۆیاندا بەزین. بەڵام ئینگلیزەکان یەکەمین سەرکەوتووەکان بوون کە ژیارەکەیان لە ژیاری هیندییەکان لەسەرتر بوو. هەر بۆیە نەکەوتنە ژێر کاریگەری ژیاری هیندستانییەوە. ئینگلیزەکان بە تێکشکاندنی کۆمەڵە هیندییە خۆجێیەکان و فەوتاندنی شوێنەوارە دەستی و هونەرییەکانیان و تەختکردنی هەموو ئەو شتانەی لە کۆمەڵگەی هیندستاندا شکۆداربوون، ژیاری هیندیان لەناو برد. لاپەڕەکانی مێژووی دەسەلاتدارەتی ئینگلیزییەکان لە هیندستان بە دژواری شتێکی سەرووتر لەم کاولکارییە پیشان دەدا. لەنێوان تەپۆڵکی وێرانییەکاندا بە سەختی دەکرێ کاری سازکردنەوە دەستنیشان بکرێت، بەڵام سەرەڕای ئەمانەش کاری بیناکردنەوەی هیند دەستی پێکرد.

یەکپارچەیی سیاسی هیندستان پتەوتر بۆوە، ئەم یەکێتییە کە یەکەمین مەرجی سەرلەنوێ سازکردنەوەی هیندە، تەنانەت لە یەکێتییەك کە هیند لەژێر فەرمانڕەوایی مەغۆلە مەزنەکاندا وەدەستی هێنابوو پتەوتر بوو. ئەم یەکپارچەیی سیاسییە شمشێری ئینگلیزەکانی بەسەر هیندییەکان داسەپاند و

ئێستاش تەلەگراف بەردەوامتری کردووە، لەشکری خۆجێیی هیندستان لەلایەن ئەفسەرانی ئینگلیزییەوە ڕێکخراوە و مەشق دراوە کە بەبێ ئەوە ئازادی هیندستان نەدەگونجا و ئیدی لەمەودوا هەر لەبەر ئەم لەشکرە، هیندستان بە سانایی بۆ هێرشبەرانی بیانی ڕاو ناکرێ. بۆ یەکەمین جار ئینگلیزەکان چاپەمەنی ئازادیان بۆ کۆمەڵگەیەکی ڕۆژهەڵاتی بەدیاری هێنا و سەرپەرشتیارێتییەکەش کەوتە ئەستۆی ڕۆڵە هیندیی و ئەوروپییەکان، بەهاوبەشی و هەر ئەم چاپەمەنییە ئازادەش بوو بە هۆکارێکی نوێ و بەهێز بۆ ڕۆنانی کۆمەڵگەیەکی مۆدێرنی هیندی. لەهیندستاندا بۆ یەکەمین جار ئینگلیزەکان بوون کە خاوەنێتی تایبەتی زەوییان دامەزراند، واتە مولکدارێتی[٢٤] و ڕەعیەت پەروەری[٢٥]، هەرچەند ئەم دووە قێزەونن، بەلام هەڵگری دوو جۆری جیاوازی خاوەنێتی تایبەتی زەوین و لە کۆمەڵگەی ئاسیاییدا خاوەن بوون ئاواتێکی مەزن بوو. لەنێوان خەڵکی خۆجێیی هیندستاندا کە بەبێ مەیلی و ناقایلی لەژێر چاودێریی ئینگلیزەکاندا دەرسیان خوێندووە، چینێکی نوێ سەریهەڵداوە کە بەهونەری مۆدێرنی حکوومەتکردن و زانستی ئەوروپی ئاشنان. هێزی هەڵمی، پێوەندی خێرا و ڕێکی هیندستانی لەگەڵ ئەوروپادا ڕێکخستووە وهیندستانی لەو پەراوێزییەی کە وەك هۆکاری سەرەکیی دواکەوتوویی و چەقیوی ئەو وڵاتە لە قەڵەم دەدرا، دەرهێنا. ئەو ڕۆژە زۆر دوور نییە کە لە سۆنگەی ڕێی ئاسن و کەشتی هەڵمییەوە مەودای ئینگلیز و هیندستان بۆ هەشت ڕۆژ داکشێ و بەمجۆرە ئەم وڵاتە ئەفسانەییە بەجیهانی ڕۆژئاواوە پەیوەست بێت [...].



پیشەسازیی مۆدێرن لە سیستمی ڕێی ئاسنەوە سەرچاوە دەگرێ، دابەشکردنی کاری بەشێوەی میراتی لەناو دەبات، کاستە هیندییەکان لەسەر ئەم دابەشکردنی کارە دامەزراون و کۆسپی سەرەکی سەر ڕێی پێشکەوتن و توانایی هیندستانن.

[...] سەردەمی مێژووی بۆرژوازی دەبێ بنەماکانی جیهانی نوێ دابێنێ. واتە لەلایەك پێوەندیی جیهانی بخولقێنێ کە بنەمای بە یەکترەوە بەند بوونی مرۆڤە و لەلایەکیشەوە ئامرازەکانی وەدیهێنانی ئەم پێوەندییە بەدی بێنێ و لەلایەکی تریشەوە دەبێ ببێتە هۆی گەشەسەندنی هێزە بەرهەمهێنەکان و هەروەها بەرهەمهێنانی ماددی بکا بە دەسەڵاتی زانستی بەسەر هۆکارە سرووشتییەکاندا[٢٦].

مارکس لە وتارێکی دیکەیدا لەژێر ناوی «فەرمانڕەوایەتی ئینگلیز لە هیندستاندا»کە ئەویش لە ڕۆژنامەی (نیۆرك دەیلی تریبوون، ژمارە ٣٨٥٤، /٢٥ مایس /١٨٥٣ ) بڵاوکراوەتەوە، دەنووسێ :

لە حکوومەتی ئاسیاییەکاندا هەر لە کۆنەوە سێ دیوان هەبووە: دیوانی ئیستیفا [وەزارەتی داد] بۆ دادۆشینی فەرمبەران، دیوانی **(عەرج)** [وەزارەتی جەنگ] بۆ تالاکردنی بیانییەکان و سەرەنجام دیوانی بەرژەوەندییە گشتییەکان.

مارکس پاشان دێتە سەر وەسفکردنی ئەو گوندە خۆ بەرێوەبەرانەی هیندستان و دەنووسێ :

زۆربەی ئەم شێوە کلێشەیی و چەقبەستووانە, ئۆرگانیزمی کۆمەڵایەتی پارچە کراون و لە حاڵی توانەوەدان، بەلام نەك لەبەر هۆی دەستێوەردانی

لێپرسراوی ماڵی ئینگلیزی یان سەربازی ئینگلیزی، بەڵکوو بەپێی هێزی هەڵمی و بازرگانیی ئازادی ئینگلیزی دێنە ئاراوە. لە هیندستاندا کۆمەڵە بنەماڵەیی[٢٧]ەکان لەسەر پیشەسازیی دەستی دادەمەزران و ئەم پیشەسازییە کە بریتیە لە پێکهاتەیەك لەتەشی و چەرخی بەن ڕستن و مەکینەی دەستچن و کشتوکاڵی دەستی [لەبواری ئابووری]یەوە هێزێکی خۆبەڕێوەبەری بەوان دەبەخشی، دەست تێوەردانی ئینگلیزی بوو بە هۆی ئەوەی کە تەشی ڕێس لە بەنگاڵدا و جۆلا لە (لانکاشایر)دا جێگیر بن و بەدوای ئەمەشدا، ئەم کۆمەڵە بچووکە نیمچە بەربەر ـــ نیمچە شارستانییانە پەرتەوازەبن و بە هەڵوەشانەوەی بنجی ئابوورییەکەیان، مەزنترین و ئەگەر بمانەوێ ڕاستی بڵێین تاقانە شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی ڕوویدات کە ئاسیا بەخۆیەوەی بینیوە.

هەرچەندە دەبێ هەستی مرۆڤانەی ئێمە پێی ناخۆش بێت کە ببینین ئەم هەزاران ڕێکخراوە باوك سالارییە تێکۆشەرو بێ بەرگریی کۆمەڵایەتییە لەبەریەك بلاودەبن و بەیەکەوە یەکەکانیان دابەش دەبن و کێوێك لە خەم و پەژارە بەسەر هەرکام لە تاکەکانی ئەم کۆمەڵانە دادەڕووخێ و هەریەك لەوانەش هەم ژیاری کۆنی خۆیان لەدەست دەچێ و هەمیش ئامرازی بەمیرات ماو بۆ بژێویان، بەلام نابێ لەبیری بکەین کە ئەگەرچی ئەم کۆمەڵە گوندییانە بێ بەرگری دێنە بەرچاو، بەلام بەردەوام بناغەیەکی پتەو بوون بۆ سەرەڕۆیی ڕۆژهەڵاتی و زەینی مرۆڤیان لە بازنەیەکی تەسکدا زیندانی کردووە و ئەوانیان لە بەرانبەر خورافات ئامێریدا بێ دەسەلات کردووە و کردوویانی بە کۆیلەی دابونەریتی کۆن و لە هێز و وزەگەلی مەزن و مێژوویيان بێ بەش کردوون. هەربۆیە نابێ بەسەر بەربەرییەتی خۆپەرستانەدا بازدەین کە لە



پارچە زەوییەکدا جێگیر بووە. ئەم بەربەرییەتە بەهێوری شایەدی لەناوچوونی ئیمپراتۆرییەکان و پەنابردنە بەر دڵڕەقی و بێ بەزەیی وەسف نەکراو و قەلاچۆکردنی خەڵکی شارەگەورەکان بووە و هەمووی ئەم ڕووداوانەی کە بەسەریدا باریون، بە ڕووداوی سروشتی داناوە. ئەم بەربەرییەتە خۆپەرستانەیە بۆ خۆشی بۆتە خۆراکی داماوی هێرشبەرێك کە تەنانەت لەرووی بەزەیشەوە سەرنجێکی نەداوەتێ. نابێ لەبیری بکەین ژینی ئەم جۆرە کۆمەڵە بچووکانە بۆرە ژیانێکی وەستاو و گیا ئاسا بووە، بەلام هەر ئەم ژینە داماوانەیە لە جێگای دیکە چالاك و پڕبزاڤ و جوولەیە، واتە لە هێزە کاولکەرەکان، دژ، دڕندە، بێ ئامانج و بەرەلاکاندا. لە هیندستاندا ئەم شێوەژیانە داماوانەیە، کوشتنی مرۆڤ، بەنەریتی ئایینی دەزانێ. نابێ لە بیر بکەین کە ئەم کۆمەڵە بچووکانە بەو جیاوازییانەی کە بە جۆرێ کاست و کۆیلەتییەوە ئاوێتەبوون، لەجیاتی ئەوەی مرۆڤ بکەنە سەروەری ژینگە، ئەویان کردۆتە ملکەچی ژینگە. ئەم کۆمەلانە، دۆخی کۆمەلایەتی کە دەبێ لە گۆڕاندابێ، بە چارەنووسێکی سروشتییان زانیوە کە هەرگیز ناگۆڕێ و بەمجۆرەش پەرستنی دڵڕەشانەی سروشت دەهێنێتە ئاراوە و ئەم پەرستنە بۆ پلەیەك دابەزیوە کە مرۆڤ واتە سەروەری کائینات لە بەرامبەر مەیموون و گادا کڕنۆش دەبا و ئەوان دەپەرستێ.

ڕاستەکە ئینگلیز لە بەدیهێنانی شۆڕشی کۆمەلایەتی لەهیندستاندا تەنیا بۆ بەرژەوەندی نزم، وروژێندراو[هەولی داوە] و لە بەپراتیککردنی ئامانجەکانیدا گەمژەیی لەخۆنیشان داوە، بەلام کێشەکە ئەمە نییە، بەڵکو کێشەکە لەوەدایە کە ئاخۆ مرۆڤ دەتوانێ بگا بەئامانجی خۆی بێ ئەوەی

شۆڕشێکی بنچینەیی لە دۆخی کۆمەڵایەتی ئاسیادا ڕوبدات؟ ئەگەر وەڵام نەرێنییە، کەواتە تاوانەکانی ئینگلیز هەرچی دەبن بابن. ئینگلیز ئامرازی نائاگایی مێژووە بۆ سەرهەڵدانی شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی لە ئاسیادا. هەرکات دیمەنی ڕووخانی جیهانی کۆن بەمەزاجی هەستەکانی ئێمە ناخۆش بێت، دیسانیش لەڕوانگەی مێژووەوە ئەم مافەمان هەیە کە *وێڕای (گۆتە) دەنگ هەڵبڕین:*

*ئاخۆ دەبێ ئەم مەینەتییە*
*کە ڕەزامەندییەکی پتری بۆ ئێمە هێناوە*
*ببێتە مایەی نیگەرانیمان ؟*
*مەگەر لەحکوومەتی تەیموردا*
*بێ ژمارە مرۆڤ قەڵاچۆ نەکران ؟*[٢٨]

بەڵام ڕوانگەی مارکس لە بارەی ئەرکی ئیستعمارەوە بۆ گۆڕانکاری و مۆدێرنیزەکردنی کۆمەڵگا ئاسیاییەکان لەڕادەبەدەر ماتریالیستی و پۆزەتیڤیستییە و هەر ئەم ماتریالیزمە کاڵ و کرچە سەرەنجام بە ئایدیالیزمێکی ڕووکەشیانە و گەشبینانە کۆتایی دێت[٢٩]. هەڵبەت وڵاتە داگیرکراوەکان لەلایەن ئینگلیزەوە وەك (ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کەنەدا، ئوستralia و نیوزیلەندە) سەربە وڵاتانی پێشکەوتووی جیهانن. پێڕەوانی مارکس هۆکاری ئەم دۆخە بەمجۆرە پاساو دەدەنەوە کە کۆچبەرییەکی بەربڵاو لە وڵاتی مێتروپۆلیتەن (ئینگلیز) ەوە کراوە بۆ وڵاتانی داگیر کراو، بەڵام ئەم کۆچکردنە بەربڵاوە بەهۆی کەڵەکەبوونی حەشیمەت لە وڵاتانی ئاسیاییدا نەدەگونجا.



خاڵێکی گرنگ کە دەمێنێتەوە ئەمەیە کە سەرەڕۆیی ڕۆژهەڵاتی دەتوانێ هەرکات حەزبکا، دەست بەسەر سامانی کەسەکەدا بگرێت و کەم و زۆر بەسەر بازرگانی دەرەکی وبەرهەمهێنان و دابەشکردنی بەرهەمەکاندا چاودێری بکات. ئەو سوسیالیزمەی کە مارکس بانگەشەی بۆ دەکات و ئەو ئەرکانەی بۆ دیکتاتۆری پرولیتاریا دەستنیشانی دەکات لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگەی ڕۆژهەڵاتی و سەرەڕۆیی ڕۆژهەڵاتیدا وێکچوونێکیان لەنێواندا هەبوو. مارکس بۆ خۆی بەم وێکچوونانەی زانیبوو و لەکۆتایی تەمەنی خۆیدا بەرانبەر بە (سەرەڕۆیی ڕۆژهەڵاتی)و (شێوەی بەرهەمهێنانی ئاسایی ) بێدەنگی ڕەچاوکرد، بەڵام دژبەرانی ئەو، و لە سەرووی هەمووانەوە ***میخاییل باکونین*** (شۆرشگێڕی ڕووسی ١٨١٤ ــ ١٨٧٦ ) یش بە وێکچوونی نێوان بەرنامەی سوسیالیزمی مارکس و سەرەڕۆیی ڕۆژهەڵاتی زانی و لەبەر ئەم هۆیە باکونین مارکسی بەوە تاوانبار کرد کە دەیهەوێ بە سوسیالیزمی دەوڵتی خۆی، نەك ئامێرەکانی ڕزگارکردنی مرۆڤ، بەڵکو ئامرازی کۆیلەتی ئەو دەستەبەر بکات[٣٠] ئەزموونی تاڵانی سوسیالیستی ئەم پێشبینییەیان پشتڕاست کردەوە.

## پەراوێزەکان

1.Total Pawer
2.Karl wittfogel, oriental despotism, Yale U.P.1957,P.10
3.Despotism
4.The politics of Aristotle(Translated by Ernest Barker),Oxford U.P.1948,(III,IX,p.183
5.Sandjaks

٦ـ شهريار، ترجمه داريوش آشورى (ترجمه فارسى كمى تغير داده شده است)،تهران، نشر پرواز،١٣٦٦ (فصل چهارم)، ص (٤٠).
٧ـ هەمان سەرچاوە (فصل نوزدەهم) ص٧٩ ــ ٨٠ ).

8.J. Bodin
9.Tyranny
10.T. Harrington
11.Bernier
12.P.Bayl
13.Funamental laws
14.A fundamental law
15.Statute
16.Duration
17.Louis Althusser,Montesquieu,La politique et L,histoire, presses Universitiarires de France 1959, pp. 88-91



18.Adam smith,The wealth of Nations, London:Dent 1957, Vol.II,P.173.
19.Tyrrany
20.G.W.F.Hergl,Werke,Suhrkamp 1970,Bd. 12, S.202.
21.IBID,S.215
22.Ibid,S194
23.Ibid, S.143-145
24.Zemindari
25.ryotwari
26.K.Marx,"The future results of the British Rule in India", K. Marx & F. Engel , on colonialism
27.Family-communities
28.K.Marx, "The British Rule in India", K.Marks & F.Engels,on colonialism,pp. 37-41.

* مارکس و ئەنگلس ڕووسیاشیان بە وڵاتێکی نیمچە ئاسیایی و ڕژێمەکەشیان بەجۆری سەرەڕۆیی ڕۆژهەڵاتی دادەنا. مارکس بۆ خۆی سەبارەت بە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ڕووی خۆش نەبوو.

***پێری ئەندێرسۆن*** لە بەرهەمەکەی «نەوەکانی ویلایەتەسەرەڕۆکان» دا بە کورتی روانگەکانی مارکس لەبارەی چین بەمجۆرە باس دەکات:

«هەم مارکس هەم ئەنگلس زۆرجار چەند تایبەتمەندییەکی گشتییان بۆ ڕۆژهەڵات دەستنیشانکردبوو کە بۆ چیینیشیان بە ڕەوا دەزانی»

لە ڕاستیدا ئاماژەکانی ئەوان هونەری و پسپۆڕانە نین.مارکس سەبارەت بە چین دەڵێ: «ئیمپراتۆری ئاسمانی لەشکان نەهاتوو»، «قەڵای پتەوی کۆنەپەرستی و کۆنەپارێزی» کەلە هەموو بوارێکەوە «خاڵی بەرامبەری ئەوروپایە» «چین بەربەریانە و پەراوێزیانە بەجیا لە

جیهانی پێشکەوتوو دەژی». «ئەم نیمچە ژیارە گەندەڵە» و «کۆنترین ئیمپراتۆرێتی جیهان» لەشوێنی خۆیدا لاسایی «گەمژەیی میراتی» دەکاتەوە و بە پێچەوانەی چرکەکانی زەمەن ژیانی گیائاسای خۆی تێپەڕدەکات ». چین «نوێنەری جیهانی پووچەڵ کراوە»: بەڵام تێدەکۆشێ کە «خۆی بەم وەهمەوە هەڵخەڵەتێنێ کە کەماڵی ئاسمانییە.»مارکس لە وتارێکی گرنگی خۆیدا کە لە ساڵی (١٨٦٢) دا نووسیویەتی، فۆرمۆلی ستاندەری خۆی لە سەرەڕۆیی ڕۆژهەڵاتی و شێوەی بەرهەمهێنانی ئاسیایی بۆ جارێکی دیکەش لەبارەی چین بەکار دێنێتەوە. ئەو سەبارەت بە ڕاپەرینی تای پینگ بەمجۆرە دەدوێ کە چین «ئەم فوسیلەزیندووە » لەبەر شۆڕش ئاڵۆز بووە. پاشان دەڵێ: «هیچ شتێکی سەیر و سەرنج ڕاکێش لەو ڕاپەڕینەدا نییە، چونکە بنەما کۆمەڵایەتییەکانی ئیمپرتۆرییە ڕۆژهەڵاتییەکان بەردەوام بێ بزاڤ و وەستاون. ئەم کارە دەبێتە هۆی ئەوە کە لە جیاتی ئەوەی هێزی هاووڵاتیانیان لە ڕێگای بیناکردنەوەی کۆمەڵگەدا بەکاربێت، لەناو هاووڵاتی و هۆزەکانیاندا ئاژاوەی پەیتا پەیتا هەبێ کە ئەوان هان دەدات کۆنترۆڵی پێکهاتەی سیاسی بگرنە دەست ». ئاکامە عەقڵییەکانی وەها بۆچوونێك لەم دادەوەرییەی مارکسدا سەبارەت بە ڕاپەرینی تای پینگ بە جۆرێکی ڕاچەنێرانە ئاشکرا دەبێت (بە بڕوای پێری ئەندێرسۆن) ڕاپەرینی تای پینگ مەزنترین و تاقانە شۆڕشی جەماوەرە چەوساوە وسەرکوتکراوەکان بوو کە لەسەدەی نۆزدەیەمدا ڕووی دا. بەڵام دادوەری مارکس لەسەر شۆڕشگێڕانی تای پینگ توند و دوژمنانەیە. ئەو ئەوان بەمجۆرە وەسف دەکات: «ئەم شۆڕشگێڕانە لەبەرچاوی کۆمەڵانی خەڵك لەفەرمانڕەوایانی کۆن قێزەونترن. دەڵێی چارەنووسی ئەوان شتێکی جیا لەمە نەبووە کە بەکاولکارییەکی مەزن و قێزەونانە، بەگژ چین و کۆنەپەرەستیی پارێزکارانەدا بچنەوە. بەڵام وێرانکارییەکانی ئەوان تۆزێك سازکردنەوە و داهێنانی پێوە دیار نییە». ئەم شۆڕشگێڕانە کە لە نێو «لات و لوت و تاکە بەرەڵاکاندا» هەڵبژێردراون، دەسەڵاتی تەواویان هەبووە کە هەموو بێ حورمەتی و نارەواییەك دەرهەق بە ژنان و کچان بە ڕوا بزانن(شۆڕشگێڕانی تای پینگ) پاش دەساڵ نیمچە چالاکییەکی بەهات و هاوار، هەموو شتێکیان وێران کرد بێ ئەوەی شتێك وەدی بێنن.



شایانی گوتنە کە ڕوانگەی مارکس و ئەنگلس لە بارەی وڵاتانی ئاسیایی و ئەفریقیایی و ڕۆڵی ڕۆژئاوا لەواندا لە دژایەتییەکی توندی ڕوانگەکانی (لینین), ستالین، مائۆ، سمیرامین و ئاندەر گوندر فرانك ــ ە. بیلوارن ئابووریزانی مارکسیستی ئینگلیزی لەکتێبەکەی (ئیمپریالیزم پێشەنگی سەرمایەداری)دا ڕوانگە کلاسیکیەکانی (مارکس و ئەنگلس)ی سەبارەت بە ئیمپرایالیزم ژیاندۆتەوە و کتێبەکەی (لینین)یشی بەناوی (ئیمپریالیزم دوا قۆناغی سەرمایەداری) خستۆتە بەر ڕەخنە.

**سەرچاوە:**

زبان، اندیشه و فرهنگ( مجموعه مقالات) ترجمەو تألیف یدالله موقن ( ص١٨٠ ــ٢٠٠ ).

## ١- زەین ( = سەبجێکت) وبابەت ( = ئۆبجێکت)[(١)]

بۆ ئەوەی چوارچێوەی هزری ئوستوورەیی بناسرێ، دەبێ لەگەڵ چوارچێوەی هزری زانستی ــ ئەزموونیدا بەراورد بکرێ.

مرۆڤـ بۆبەدەست هێنانی زانست ناچارە لەنێوان ئەوکاریگەرییە هەستییە ناسەقامگیر و بزێو (سەیال) و جیانەکراوانەی کە لە ڕێگەی هەستەکانییەوە لەسروشت وەریاندەگرێ، پێوەندیی، یان ڕێژە نەگۆڕەکان بدۆزێتەوە ودەست نیشانیان بکات. ئەم پێوەندییانە، پێکهاتەی نەگۆڕی «بابەت» [یان ئۆبجێکت] وچوارچێوەکەی پێکدێنن. هزری زانستی ــ ڕەخنەگرانە، چەمکی «بابەت» تا بنەماعەقلانییەکانی دەپشکنێ و هەوڵ دەدات قەتعییەتی هەبوونی بابەت لە ڕێگەی پێوەندیی نەگۆڕەوە، بەتایبەت **ڕادە** و **ژمارەوە** دەربخا. چونکە ئەم دووە، واقیعییەتی شتی ئەزموونکراو دەردەبڕن. کەواتە هەرتێگەیشتن و درك پێکردنێکی شتی ئەزموونکراو یان ڕووداوێکی ئەزموونە پێویستی بەهەڵسانگاندنێکی ڕەخنەییانەی ئاوا هەیە. هزری زانستی ــ ڕەخنەگرانە، بەردەوام هەوڵ دەدا لە نێوان کاریگەریی هەستیی، وتەنانەت کاروباری سیاسی وکۆمەلایەتیشدا، توخمی نەگۆڕ لە توخمی بگۆڕ، و دیاردەی ڕواڵەتی (عرضی ) لە دیاردەی سەرەکی وبنەرتیی، جیابکاتەوە، و هەربابەتێکی ئەزموونی، نەك بەتەنیا، یان بە شێوەی ڕاستەوخۆ بهێنێتە ئاراوە، بەڵکوو لەپێوەندی لەگەڵ ئەزموونیشدا، وەك گشتێك هەڵێسەنگێنێ



و تاقی بکاتەوە. ئەگەر هاتوو، ئەم دیاردە ئەزموونییە لەپێوەندی لەگەڵ گشتی ئەزموونەکەدا، دانی پێدانرا، لەهەرێمی واقیعییەتدا وەردەگیرێ و بوونی بابەتییانەی دەردەکەوێ.

هزری زانستی ئەم شێوە ڕەخنەگرانەیە لەبەرامبەر کاریگەریی هەست (وبواری واقیعی کۆمەلایەتی ومێژوویی) ودیاردەی فیزیکیشدا بەردەوام دەپارێزێ؛ لەوانەیە لەپاشان ڕوون بێتەوە کە ئەم توخمانەی ئەو، بە بەردەوامی دادەنان، بەردەوامییەکەیان ڕێژەییە وبوونەکەیان بە «توخمی بەردەوامتر»ەوە بەندە. لەهزری زانستی ــ ڕەخنەییدا، بە ڕەچاوکردنی ئەم شێوە ڕەخنەگرانەیە، سنووری نێوان «زەین» و«بابەت» هەرلە سەرەتاوە فۆرمێکی چەسپاوی نابێت، بەڵکوو بە بەردەوام بوون لە سەر تاقیکردنەوە و ئەزموون کردن و بەدەست هێنانی بنەمای تیۆری زانستی، بەردەوام ڕوولەگۆڕانە. ئەو شتانەی بەواقیعییەتی بابەتییانەی ناودەبەین، تەنیا بەدوای ڕەوتێکی ژیرەکییانەی بژارکردن وهەڵسەنگاندنی کاریگەریی هەست (یان ڕووداوی کومەلایەتیی ومێژووییەکان) و شیکردنەوە و لێکدانیانەوەیە کە دوایین سیما و شێوەیان دەردەکەوێ. دەبێ لە بیرمان بێت کە ئەم ڕەوتە پەیتاپەیتا دووپات دەبێتەوە و واقیعییەتی بابەتیانە (چ فیزیکی،چ کۆمەلایەتی) سەر لە نوێ هەڵدەسەنگێندرێتەوە و دەنرخێندرێتەوە. تایبەتمەندی سەرەکی ئەم ڕەوتە ژیرەکییانەیە، شێوە ڕەخنەگرانەکەیەتی. بەلاَم تایبەتمەندی سەرکیی هزری ئوستورەیی، شێوە سۆزاوی (**عاطفي**) یەکەتی. مامڵەی هزری ئوستورەیی لەگەڵ جیهاندا، لە ڕاستیدا، وەك مامڵەی «من » لەگەڵ «تۆ »وایە. کە واتە ڕووبەڕوو بوونەوەی ژینە لەگەڵ ژیندا. لە هزری

ئوستوورەییدا تاك پاژێکی جیاوەنەبووی کۆمەڵگایە و کۆمەڵگاش لەبەستێنی سروشتدایە و بە هێزەکانی سروشتەوە بەندە. هێندێ لەم هێزانە لەگەڵ مروڤــ (یان کۆمەڵگاکەی) دا تەبان و لەکاتی پێویستدا بە فریای دەگەن و هێندێکی دیکەیان، دوژمنی ئەون. کەواتە جیهان لە دوو دەستە هێزی دۆست و دوژمن پێکهاتووە.

## جیاوازیی نێوان هزری زانستی و هزری ئوستوورەیی

هەرلێرەوە جیاوازیی نیوان هزری زانستی و هزری ئوستوورەیی دەست پێدەکات. هزری زانستی، هەرشت یان دیاردەیەکی سروشتی بە بەشی گروپ یان کۆمەڵەیەك دادەنێ کە لەگەڵ شت یان دیاردەی وەك خۆی هاوسیمایە. کەواتە زانست، شت یان رووداو بەو پاژانە دەزانێ وا ملکەچی یاسای گشتین و لەبەر ئەمەش رەوشتیان لە هەلومەرجی دیاردا، چاوەڕوان وپێشبینی دەکرێ. بەلاّم هزری ئوستوورەیی دیاردەکان وەك « تۆ» دادەنێ. ئەم « تۆ» یە بێ هاوتا و تاقانەیە و سیمای پێشبینی نەکراوی هەرتاکێکی بێ هاوتای هەیە. بوونێکە تا ئەو شوێنە دەناسرێ کە خۆی دەربخا. « تۆ» درك پێناکرێ یان بۆهزرین نابێت، بەڵکوو دەبێ لە پێوەندییەکی چالاك و بەرانبەردا بەشێوەیەکی سۆزاوی تەجرەبە بکرێ. لە هزری ئوستوورەییدا هەموو دیاردە سروشتیەکان، وەك گرمە و بروسکەی هەور، کەوتنەخوارێی شت، ویشکەساڵی، هەڵکشان وداکشانی دەریا و لە مجۆرە شتانە وەك « تۆ» دادەنرێن. ئەم « تۆ» یە لێرە بەبەزەییە و لەوێ بێ بەزییە وهەرلەم رووەوەیە



کە هزری ئوستوورەیی بەردەوام لە زیندانی دیاردەکاندا دەمێنێتەوە و لە نێوان بوون و دیار(نمود) و « زەینییانە» و « بابەتییانە» دا جیاوازییەك دانانێ و لە دەرخستنی یاساگشتییەکانی زاڵ بەسەر دیاردەکاندا داماوە.

لەهزری زانستیدا ریزبوون و نەزمی دیاردەیەك و پێویستیی بوونەکەی، لەگەڵ گشت پێڕەوە چەمکییەکەدا هەڵدەسەنگێندرێ و هەرئەم گشتە، بەپێوەری نرخاندنی هەقیقەتی دیاردەی ئەزموونی و ئەو « واقیعییەتەی » هەیەتی دادەنرێ. بەمجۆرە لە پێکهاتەی تیۆریی جیهانی ئەزموونیدا، هەربابەتێکی پاژیانە، راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ دەگەڕێندرێتەوە بۆبابەتێکی گشتی و لە پێوەندی لەگەڵ گشتدا دەنرخێندرێ. بۆ نموونە هزری ئوستوورەیی لە پێوەندی لەگەڵ کەوتنەخوارێی شتەکان، لەنێوان کەوتنی «ئەم» شتە «لێرە» و «ئێستا»، لەگەڵ کەوتنی «ئەو» شتە «لەوێ» و«دوێنی» پێوەندییەك نابینێ و هەر رووداوێك بە بێهاوتا دەزانێ؛ بەلاّم هزری زانستی کەوتنی هەرشتێك بەجۆرە رووداوێك دادەنێ و بەدوای دەرخستنی یاسایەکدا دەچێ، کە کەوتنەخوارێ هەمووشتەکان بگرێتەوە. مەبەستی هزری زانستی بەدەست هێنانی ئەم پێکهاتە گشتیی و جیهانگیرەیە تاکوو تێیدا، هەموو بابەتە وردەکان یان دیاردەکان لە تاقانەیی ئەزموونیدا درك پێ بکرێن. بەلاّم بۆگەیشتن بەم پێکهاتە گشتییە دەبێ لە شیکردنەوە ولێکدانەوەوە دەست پێبکرێ. واتە پێش ئەوەی کە ناوەرۆکەکانی ئەزموون رێك بخرێن و وەك گشتێکی پێکهاتەمەندیان لێ بێ، دەبێ بگۆڕدرێن. بۆ ئەم کارەش سەرەتا دەبێ ئەوانە شی بکرێنەوە تا بگەین بەتوخمی سادە، ئەم توخمانە کاریگەریی هەستی راستەوخۆ ناتوانێ بەدەستیان

بێنێ و ئەم ناوەرۆکانە ناکرێ بخرێنە یاسای گشتی وجیهانگیرەوە و دەست نیشان بکرێن؛ چونکە بزێو(سەیال) و جیانەکراوەکان.

بۆ وەدەست خستنی نەزمێکی بەردەوام لە نێوان دیاردەکاندا دەبێ بچینە ناو«بنەچەك» یانەوە. بۆنموونە لەرێگەی بەرکەوتنەوە (دەست لێدان) گەرمای شتێك هەست پێدەکرێ، بەلاَم بۆ دەربڕینی گەرمای شتەکە، دەبێ بەرەو دیوی دەرەوەی گەرماکەی بچین. تەنیا کاتێك کە شتەکەمان وەك پێکهاتەیەك لە وردیلە (ئەتۆم) وگەرماکەشیمان وەك هۆی جولەی وردیلەکان پێناسە کرد، گەرمای شتەکەمان بەروونی دەربڕیوە. بەبێ بەدەست هێنانی ئەم توخمە سەرەتایی وسادانە (وەك ئەتۆم لە سەرەوە ئاماژەمان پێکردن )، زانست بێ بنەچەك دەبێ؛ چونکە ناوەرۆکە هەستییە جیانەکراوەکان و ئەو وێنانەی لە رێگەی هەستەکانەوە درك پێدەکرێن، بنەچەك وبناغەیەك بۆهزری زانستی ـــ ئەزموونی ئاراستە ناکەن. لێکدراو (ترکیب) ێك کە هزری ئەزموونی هەولْ دەدا بەدەستی بێنێ، بەردەوام پێویستی بەشیکردنەوەیە وتەنیا بەپێی شیکردنەوە، لێکدان دەگونجێ. لێکدان، شیکاریی بەپێش گریمانە دادەنێ و مەبەستی شیکاریش هەموارکردنی رێیە بۆلێکدان.

## چوارچێوەی دەست نیشانکراوی جیهانی زانست

لە رێگەی دووکردەی پێچەوانە(معکوس)ی شیکاریی و لێکدان و پێکبەندبوونیانەوەیە کە جیهانی زانست، چوارچێوەی دیاریکراوی بەدی دێنێ. لێرەدا پێویستە بەهێنانەئارای نموونەیەك بابەتەکە روون بکەینەوە، کاتێ کە گوللەیەك لە لولەی تۆپێکەوە بەرەو نیشانێك دەهاوێژرێ، سەرەتا



بەرەوسەر دەچێ وپاشان بەرە وخواردێ. تەنیا بەچاو رەوتی گوللەکە بەووردی دیاری ناکرێ. بەلاَم ئەگەر کۆی ئەو بارودۆخانەی وا هاوکات لەسەر رەوتی گوللەکە کاریگەریی هەیە، لەیەکترجیا بکەینەوە و پاشان هەریەك لەوانە، بەلەبەر چاوگرتنی یاسای زالْ بەسەر ئەودا، جیاجیا تاوتوێ بکەین، دەتوانین رێڕەوی گوللەکە دیاری بکەین. واتە دەبێ دەست نیشانی بکەین کە رێڕەوی گوللەکە بەدووهێزی جیاوازەوە بەندە. ئەم دوو هێزە یەکیان زەبری سەرەتاییە و ئەوی دیکە هێزی کێشانی زەوییە کە گوللەکە بەرەو ناوەندی خۆی رادەکێشێ. دوای ئەوەی کە رەوتی گوللەکەمان بەم دوو سیمایە شیکردەوە، دەتوانین بە لێکدانی سەر لەنوێیان رەوتی گوللەکە دیاری بکەین.

بەمجۆرە دەبینین کە لە هەرێمی هزری زانستیدا، چەمکی « بابەتی» بەندە بەشیکردنەوەی بەردەوامی توخمی تەجرەبە و پاشان لێکدانی سەرلەنوێیانەوە. لەکاتی شیکاریدا، عەقلْ، توخمی روالەتیی لە توخمی بنەڕەتیی وپێویست، وتوخمی بگۆڕ لە توخمی نەگۆڕو بەردەوام جیادەکاتەوە , ئەم پرۆسەیەی بژاری توخمەکانی ئەزموون، ئامرازی سەرەکی بیرکردنەوەی زانستییە.

هزری ئوستوورەیی لە جیهانی وێنەدا دەژی، جیهانێك کە بەتەواوی بەبابەتی دەزانێ، بەلاَم پێوەندیی ئوستوورە لەگەلْ ئەم جیهانەدا هیچ نیشانەیەکی لەو دۆخە « قەیرانییە»ی، کە سەرەتای هزری زانستی ـــ رەخنەگرانەیە تێدانییە.

ئەو واقیعییەتەی کە ئوستوورەی پێ پڕدەبێت ،واقیعییەتێکی جیانەکراوەیە و هزری ئوستوورەیی ئامرازی وەك بژار کردن وهەلْسەنگاندن و شیکاری و لێکدانی نییە تاکوو بتوانی «سات» بەولاوترەوە بەرێ، واتە بە

رابردوو یان داهاتوویەوە بلکێنێ؛ یان وەك بابەتێکی ورد بەگشت توخمەکانی واقیعییەتەوە گرێی بدات و ئەمە هەمان کارە کە هزری زانستی دەیکات، واتە هەر بابەتێکی ورد بە بابەتی وردی دیکەوە پێوەند دەدات و لەئاکامدا هەموویان دەباتە ژێر یاسایەکی گشتی یان پرۆسەیەکی گشتییەوە.

ئاگایی ئوستوورەیی دیلی کاریگەریی هەست و بوونی ساتیانەیەتی وگیرۆدەی دیاردەی (روواڵەتی) تۆخ دەبێ؛ نە هاندەرێکی هەیە و نە ئامرازێك کە ئەوەی «لێرە» و «ئێستا»دا ئاراستە دەکرێت، هەڵیسەنگێنێ و بابەتێتی ئەو بەهۆی ئەو شتەی کە«لێرە» و«ئێستا» ئاراستە نەکراوە، واتە ئەوشتەی سەر بە رابردوو یان داهاتووە، ببەستێتەوە و دەست نیشانی بکات. و ئەگەر ئەم پێوەرە کە بە پێوەرێکی ناوبژیکارانەی ناودەبەین و بناغەی هزری زانستی ـــ رەخنەگرانە پێکدێنێ لە ئارادا نەبێ، تەواوی «هەقیقەت» و واقیعییەت لە «ئامادەیی (حضور)»ی کەوتنە ژێرکاریگەریی هەستیی تۆخدا دەتوێتەوە و هەموو دیاردەکان هاونرخ و هاوئاست دەبن. لێرەدا ئیدی، توێژاڵ و پلەی جۆراوجۆری واقیعییەت لە ئارادانین. واتە توخمی سەرەکی و پێویست لە توخمی رواڵەتی(عرضی)، و توخمی نەگۆر و بەردەوام لە توخمی بگۆڕ و نابەردەوام جیا ناکرێنەوە؛ لەئاکامدا، وێنەی بەرهەم هاتوویی واقیعییەت، رووکەشیانەیە وقووڵ نییە؛ و لە نێوان بابەتی ورد وبابەتی گشتی و ورد وگشتدا و لە نێوان بابەتی ساتی و بەردەوامدا جیاوازییەك لە ئارادا نییە. کەواتە هزری ئوستوورەیی ناتوانێ لە نێوان «زەینی» و «بابەتی»، ئاوات وبەدی هاتنیدا، لە نێوان شت و وێنەکەیدا، لە نێوان خەو وبەخەبەریدا و لە نێوان مردوو و زیندوودا جیاوازییەك دابنێ.



**دیاردەی سروشتیی لە سیمای رووداوی تاکدا**

هزری ئوستوورەیی دیاردەی سروشتی یا کۆمەڵایەتیی وەك رووداوی تاك وتەنیا دەبینێ. لێکدانەوە و راگەیاندنی ئەم رووداوانە و روونکردنەوەشیان تەنیا لەچوارچێوەی دەسەڵاتی هێندێ هێزدا شیاوی بەبیردا هاتنە و ناچار بەشێوەی چیرۆکێکی لێدێ. بۆنموونە هزری زانستی روونی دەکاتەوە کە چۆن هێندێ گۆڕانی کەشوهەوا، ویشکەساڵی لەناودەبات و دەبێتە هۆی بارینی باران، بەڵام هەر ئەم بوارە لە واقیع بابلییەکان دیتیان وەمەلی غول ئاسای ئیمدوگود (Imdugud )یان وەك هۆی بارینی باران دەزانی و پێیان وابوو کە ئەم مەلە، بە باڵە رەشە فەرتەنەزاکانی ئاسمان دادەپۆشێ وگای ئاسمان، کە هەناسەی گەرمی، کێڵگەکان دەسووتێنێ، هەڵدەدڕێ و هەڵدەلووشێ. لە زۆر کۆندا مرۆڤ بە درووست کردنی ئەم ئوستوورانە نەدەیانویست خۆیان سەرگەرم بکەن و نەخوازیاری هێنانە ئارای روونکردنەوەی عەقڵانی ئەم رووداوە سروشتییانە بوون. بوونی ئەوان بەو رووداوانەوە بەندبوو، ئەوان ئەو رووداوانەیان رادەگەیاند. ئەوان بەشێوەیەکی راستەوخۆ شەڕی نێوان ئەودەسەڵاتانەی کە یەکێ دوژمنی بەرهەمهێنان وئەوی تر دەسەڵاتێکی سامناك، بەڵام دۆست بوو، تاقی دەکردەوە. هەروەك چۆن بروسکەیەکی بەوەخت، ویشکەساڵی تێکدەشکاند و لەناوی دەبرد وئەوانی ئاسوودە دەکرد. ئەم وێنانە خولقێندراوی خەیاڵن؛ بەڵام ئەفسانە وێژییەکی تۆخیش نین. جیاوازیی ئوستوورە وئەفسانە لەمەدایە کە ئوستوورەی واقیعی وێنە وکارەکتەرەکانی خۆی نەك بەخەیاڵکردن، بەڵکوو بەمەرجەعییەتێکی کە وەرگرتن و پەسەندکردنی ئیجبارییە پێشکەش دەکات. ئوستوورە، سەرهەڵدان

وده‌رکه‌وتنی یه‌ك « تۆ» درێژه‌پێده‌دا. هه‌ربۆیه‌ خه‌یاڵ کردنی ئوستووره‌، له‌ هیچ روویه‌که‌وه‌ ئیستعاری نییه‌. ئوستووره‌ جلکی جۆرێ هزره‌، به‌ڵام ئه‌م جۆره‌ هزره‌ له‌خه‌یاڵ جیا نابێته‌وه‌ وچوارچێوه‌یه‌ك دێنێته‌ ئاراوه‌ که‌تێیدا، ئه‌زموون نه‌گه‌یشتۆته‌ ئاگایی. ئوستووره‌ وه‌ك تیۆری زانستی روون و ته‌واو نییه‌ و ئه‌گه‌رچی هه‌ست پێکراوه‌ و بانگه‌شه‌ی ئه‌وه‌ ده‌کات که‌ ئیعتباره‌که‌ی خه‌وشدار نابێ؛ به‌ڵام ئه‌م ئیعتباره‌ ته‌نیا له‌لایه‌ن ئه‌وانه‌ی باوه‌ڕیان پێیه‌تی ناسراوه‌ و وه‌رده‌گیرێ و تاقه‌تی هه‌ڵسه‌نگاندنی ره‌خنه‌گرانه‌یان نییه‌.

گوتمان هزری زانستی له‌نێوان زه‌ینیی بوون و بابه‌تی بووندا جیاوازی داده‌نێ وبۆجیاکردنه‌وه‌ی ئه‌م دووه‌ له‌یه‌کتر میتۆدێکی ره‌خنه‌گرانه‌ و شیکاری رۆناوه‌ که‌ به‌یاریده‌ی ئه‌ومیتۆده‌، دیارده‌ تاقانه‌کان به‌جۆره‌کانی دیکه‌ی رووداوه‌وه‌ که‌ ملکه‌چی یاسا گشتییه‌کانن، ده‌رده‌بڕێ. بۆنموونه‌ هزری زانستی هه‌ڵاتن وئاوابوونی رۆژ، به‌ سووڕانی زه‌وی به‌ده‌وری ته‌وه‌ری خۆیدا ده‌به‌ستێته‌وه‌، ره‌نگه‌ جۆراوجۆره‌کان وجیاوازییه‌کانیان، به‌جیاوازییه‌که‌یان له‌درێژایی پێڵه‌کانیاندا وه‌سف ده‌کات. ئه‌گه‌ر یه‌کێ له‌ خزمانی خۆمان که‌مردووه‌ بێته‌خه‌ونمان، زانست ئه‌م بیرۆکه‌یه‌ به‌خولقاوی زه‌ینی نیوه‌هۆشیاری ئێمه‌ داده‌نێ. به‌مجۆره‌ هزری زانستی تێگه‌یشتنی هه‌ستییانه‌ی ئێمه‌ له‌سه‌ر دیارده‌کان، له‌و چه‌مکانه‌ی که‌ له‌ رێگه‌یانه‌وه‌ دیارده‌کان درك پێده‌که‌ین جیاده‌کاته‌وه‌. به‌ڵام هزری ئوستووره‌یی ئامرازی شیکاریی و ره‌خنه‌ییانه‌ی نییه‌.هه‌ربۆیه‌ ناتوانێ له‌زیندانی دیارده‌ ده‌رباز بێت، له‌روانگه‌ی ئه‌و مرۆڤه‌ی ئوستووره‌ییانه‌ بیرده‌کاته‌وه‌، زه‌ینیه‌ته‌که‌ی خۆی و بابه‌تێتی لێك جیا ناکاته‌وه‌؛ واته‌ به‌رانبه‌رکێی دیارده‌ و واقیعیه‌ت بۆی نه‌ناسراوه‌.



هه‌رشتێك بتوانێ کارێگه‌ریی له‌سه‌ر زه‌ینی ئه‌و هه‌بێ یان هه‌ست و ئیراده‌ی ئه‌و بورووژێنێ، واقیعییه‌؛ که‌واته‌ به‌ڵگه‌یه‌ك له‌ ئارادا نییه‌ که‌ ئه‌و خه‌ون به‌ واقیعی دانه‌نێ. خه‌ونه‌کان زۆرجار پتر له‌ رووداوه‌ یه‌کده‌ست وماندوکه‌ره‌کانی ژیانی رۆژانه‌ له‌ سه‌ری کاریگه‌ریيان ده‌بێت. خه‌ونه‌کان له‌ روانگه‌ی ئه‌وه‌وه‌ له‌ درك پێکردنی ئاسایی هه‌سته‌کان گرنگترن. بابلییه‌کان وه‌ك یۆنانییه‌کان، شه‌و له‌ شوێنێکی پیرۆزدا رۆژده‌که‌نه‌وه‌ تاکوو رێ پێشانده‌ریی خواکانیان له‌ خه‌وندا پێ بگات. فیرعه‌ونه‌کانی میسر له‌ به‌ڵگه‌کانی خۆیاندا تۆماریان کردووه‌، خه‌ون ئه‌وانی تێده‌گه‌یاند چی بکه‌ن. له‌روانگه‌ی مرۆڤی سه‌رتاییه‌وه‌ وه‌هه‌میش واقیعییه‌. له‌ساڵنامه‌کانی ***ئازه‌ر حه‌دوونی*** ئاسووریدا ده‌خوێنینه‌وه‌ که‌ سه‌ربازه‌ ماندووه‌کان، له‌ ناوچه‌ گیان پروکێنه‌کانی بیابانی سینادا غوله‌ ئه‌فسانه‌ییه‌کان و ماره‌ سه‌وزه‌ دووسه‌ره‌کان وزینده‌وه‌رانی باڵداریان دیتبوو. میسرییه‌کانی قۆناغی پاشایه‌تی ناوه‌راستیش هه‌ژدیها وغولیان له‌ په‌نا مامز ورێوی وگیانداری دیکه‌ی بیاباندا وه‌سف ده‌کرد وبه‌واقیعییان ده‌زانین.

له‌ هزری ئوستووره‌ییدا هه‌روه‌ك چۆن له‌ نێوان خه‌و و به‌ ئاگاییدا جیاوازییه‌ك نییه‌، له‌ نێوان مردوو و زیندووشدا جیاوازییه‌ك له‌ ئارادا نییه‌. مانی مردوو و پێوه‌ندیی به‌رده‌وامی له‌گه‌ڵ مرۆڤدا وه‌ك بابه‌تێکی به‌ڵگه‌ نه‌ویست وێناده‌کرێ؛ چونکه‌ مردوو له‌گه‌ڵ واقیعییه‌تی حاشا هه‌ڵنه‌گری دڵته‌نگییه‌کان، چاوه‌روانیی و ئازاره‌کانی مرۆڤ به‌ره‌ورووه‌. له‌ روانگه‌ی هزری ئوستووره‌ییه‌وه‌ « کاریگه‌ربوون » به‌واتای «هه‌بوون» ه‌.

**تێگەیشتن لەچەمك لەرێگەی بەماددی كردنییەوە**

گوتمان هزری ئوستوورەیی لەنێوان وێنەی شتێك و شتەكە خۆیدا جیاوازییەك دانانێ: واتە هزری ئوستوورەیی لە درك پێكردنی بابەتی عەقلانی وئینتیزاعی داماوە و مەقوولەیەك بەناوی «ئایدیال» یا « چوارچێوەی تۆخ » ناناسێ.

هەر بۆیە بۆ تێگەیشتن لە مەدلوول یان چەمك دەبێ بوونێكی ماددی وهەست پێكراو (ملموس)ی پێ ببەخشرێ. ئەم كارە لە هەموو قۆناغەكانی هزری ئوستوورەییدا رەوایە، بەتایبەت لە كردەی ئوستوورەییدا. لەشانۆدا ئەوكەسەی رۆڵی شەیتان یان یەكێ لە خواكان دەگێڕێ لە كردەوەدا دەبێتە شەیتان یان خوا خۆی.

مرۆڤناسەكان پێیان وایە بۆنە ئایینییەكان لەپێشەوەی ئوستوورەكانەوەن و ئەم بۆچوونە بەتەواوی راستە؛ چونكە بۆنە ئایینییەكان یان رێورەسمەكان تەنیا وێنە یان نواندنەوە نین بەڵكوو سەرتاپا واقیعین. ئەوان وەها لە واقیعییەتی كردەدا گیرۆدەن كە بوونەتە پاژێكی جیانەبووی ئەو. لە قۆناغی جۆراوجۆری گۆڕانی كولتوری كۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا ئەم باوەڕە لە گەڵێ وێنەدا دەبینینەوە كە بەردەوامی ژیانی مرۆڤ و، لە راستیدا رزگاربوونی جیهان بە بەڕێوەبردنی دروستی رێورەسم وبۆنە ئایینییەكانەوە بەندە. سوورپێستانی *كورایی ویوئیتوتو* لەسەر ئەوباوەڕەن كە بەروبووی زەوی وزارەكانیان پتر بەبەرێوەبردنی دروستی رێورەسم و بۆنەئایینییەكانەوە گرێ دراوە نەك بە چۆنێتی كێڵان، چاندن ،ئاودێری و شتی لەم بابەتەوە.

لە تێڕوانینی هزری ئوستوورەییەوە، بۆنەئایینییەكان ئەو ئامرازە واقیعیانەن كە مرۆڤ بەیارمەتییان جیهان دەخاتە ژێر ركێفی خۆی، بەلاّم نەك بەواتای



ڕۆحانی بەڵكوو تەنیا بەواتای فیزیكی. خواكان، بۆیە بۆنەئایینییەكانیان فێری مرۆڤ كرد تاكوو مرۆڤ لەرێگەی ئەوانەوە جیهان ملكەچی خۆی بكات؛ چونكە سروشت سەرەرای سووڕانی رێكی خۆی، بەبێ بەرێوەچوونی ورد ودروستی بۆنەئایینییەكان، هیچ بەرهەمێكی نابێت. گوتمان هزری ئوستوورەیی لەنێوان پاژ وگشتدا جیاوازی دانانێ، وێنەی كەسێك لەگەڵ خۆی جیاواز نیە. وێنەی كەسیك، منەكەی ترێتی. هەر بەلاّیەك بەسەر وێنەكە بێت بەسەر ئەویش دێت. ناوی كەسێك لەگەڵ كەسەكە دایە، هەر بۆیە لەشانامەی فیردەوسیدا *ئەشكبووسی كۆشانی* لەكاتی شەڕلەگەڵ *رۆستەم*دا دەپرسێ:

بدو گفت خندان كەنام توچیست؟
تن بی سرت راكەخواهد گـریست؟
تهمتن چنین داد پــــــاسخ كــەنــــــام
چەپرسی كزین پس نبینی توكـــام
مرامــــــادرم نــــــام مرگ تــوكــــــرد
زمـــــانە مـــــــرا پتك تـــــرك تـو كـرد

[واتە (بەپێكەنینەوە پێی گوت كەناوت چییە؟ لەشی بێ سەرت كێ بۆی دەگری؟ رۆستم وەلاّمی داوە كە لە ناو بۆ دەپرسی كە لەمەوداو تۆ ژیانت نابێ، من دایكم ناوی مەرگی تۆی لێناوم، زەمانە منی كردە پوتكی سەری تۆ)]

دەبینین كە رۆستم دەترسێ ناوەكەی بەئەشكبووس بڵێ وتەنانەت ناوی خۆی بە «مەرگی تۆ»رادەگەیەنێ تا بەجۆرە بەسەرنەیارەكەیدا سەركەوێ.[٢]

ئەگەر دوژمن ناو یان وێنە و تەنانەت تاڵەموو یان نینۆكی كەسێك بەدەست بێنێ، كەسەكەی بەدەست هێناوە. بۆنموونە ئەگەرخەنجەرێك

لەوێنەکەی رۆبچێ، ئەوخەنجەرە لە لەشی ئەوکەسەشەوە رۆچووە (ڕێ نەدانی وێنەکێشانی وێنەی روخساری کەسەکان لەکۆمەڵگای سەرەتاییدا لەسەرئەم بیرۆکەیە دامەزراوە)و یان ئەگەر تاڵە موو یان نینۆکی کەسەکە لەناوبچێ، خودی کەسەکەش لەناودەچێ. سێبەری کەسەکەش ئەم دەورەی هەیە. سێبەریش منی دیکەی ئەوە وهەر زەبرێك وە سێبەرەکەی بکەوێ وەخۆشی دەکەوێ. کەس نابێ پێ بنێتەسەر سێبەری کەسێکی تر، چونکە لەوانەیە خاوەنی سێبەرکە نەخۆش بکەوێ. هێندێ جار لە ئەفریقیای رۆژئاوا بۆ کوشتنی بەنهێنی کەسێك ،خەنجەر یان نێزەیەکیان لە سێبەرەکەی رۆدەکرد. دەڵێن هێندێ هۆزی سەرەتایی لە دیتنی کۆلکەزێڕینە لەئاسمان تووشی ترس و دڵەکوتێ دێن؛ چونکە وەك تۆڕێکی دەبینین کە جادووگەرێك بۆگرتنی سێبەری ئەوان دایناببێتەوە.

## شانامە و هزری ئوستوورەیی

لە شانامە دا خوێندوومانەتەوە کە زاڵ پاش لەدایکبوونی، لەبەر سپێتی مووی، لە بیاباندا بەڕەڵای دەکەن تا ببێتە خۆراکی دڕندان. سیمۆرغ هەڵیدەگرێتەوە ودەیباتە هێلانەکەی خۆی و گەورەی دەکات تا ئەوکاتەی باوکی زاڵ لەکردەی خۆی پەژیوان دەبێتەوە و شەوێك لەخەوندا مزگێنی دەدەنێ کە کوڕەکەی زیندووە و سیمورغ پێی گەیاندووە. هەربۆیە بۆهێنانەوەی کوڕەکەی دەچێتە لای سیمورغ. سیمورغ بەزاڵ دەڵاێ:

ابـــــاخويشتن بر يكى پـــرّ من
خـــجسته بود ســــــايه فرّ من



گرت هيچ سختى بەروى آورند
ورا زنيك وبد گفت وگوى آورند
بـرآتش بـرافكن يكى پـــرّ من
ببينى هم اندر زمـــان فـــرّمن
كـه در زيـــر پـــرّت بپروەردەم
ابــــا بچگــــــــانت بــــــــرآوردەام
همـــــانگـــه بيـايم چـو ابـر سيـاه
بى آزارت آرم بـــدين جـــــايگـــاه[٣]

واتە:

[لەگەڵ خۆت پەڕێکی من بەرە، سێبەری شکۆی من متفەڕکە، ئەگەر کۆسپێکیان هێنایە سەر ڕێت و ئەگەر لە چاك وخراپ قسەیان پێ گوتی، پەڕی من بسووتێنە، لە هەمان کاتدا شکۆی من دەبینیی، چونکە لە ژێر پەڕی خۆمدا پەروەردەم کردی و لەگەڵ ڕۆڵەکانی خۆمدا گەورەم کردووی؛ هەمان کات بگەمێ وەك هەوری رەش، بە بێ ئازار بتهێنمەوە ئەم جێگەیە].

لە ئەفسانەی ئوستوورەییانەی زاڵ و سیمورغدا چەندین خەسلەتی ئوستورەیی بە دەرەوەیە :

١- لە نێوان خەو وهۆشیاریدا جیاوازیەك لە ئارا دا نییە؛ چونکە لە خەودا مزگێنی دەدەن بە سام کە ڕۆڵەکەی زیندووە و دایەنەکەی سیمورغە.

٢- هیچ سنورێك لە نێوان مرۆڤ و گیانلەبەرانی دیکەدا نییە و هەرگیانلەبەرێك دەتوانێ دایەنی مرۆڤ بێت و گەورەی بکات.

٣- وا باس لە بونەوەرێکی ئەفسانەیی وەك سیمورغ دەکرێ کە گوایە بوونەکەی وەك بوونی هەر بونەوەرێکی دیکە واقیعییە.
٤- لە بەردەستدا بوونی بەشێك لە بوونەوەرێك بە واتای لەبەردەستدا بوونی گشت بوونی ئەوە. زاڵ بە لەبەردەستدا بوونی پەڕی سیمورغ، دەڵێی گشت بوونی ئەوی لە بەردەستدایە.

هەروەك چۆن مەعریفەی زانستی بۆ دۆزینەوەی زنجیرە پلەی یاساکان و دامەزراندنی رایەڵەیەك لە پێوەندیی هۆ و بەرهۆ هەوڵ دەدات، ئوستورەش بۆ دامەزراندنی زنجیرە پلەی هێزەکان و خوداکان تێدەکۆشێ.

هەرچەند ئوستوورە، جیهان بە بەشی جیاواز دابەش بکات و بەخوای جۆراوجۆریان بسپێرێ و هەرێمی واقیعییەتی ماددی و مرۆڤایەتی بخاتە ژێر رکێفی ئەوانەوە، جیهان درك پێکراوتر دەبێت. ئەگەرچی جیهانی ئوستوورەیی بەم شێوەیە لە گشتێکدا پێکەوە دەتەنرێ؛ بەلاّم خەسلەتی ئەم گشتە شهوودییە، لەگەڵ گشتە چەمکییەکە لە مەعریفەی زانستیدا جیاوازی هەیە. لە گشتی ئوستوورەییدا، پێوەندییەکان ( پێوەندیی تاك بە جۆر یا تاك بە رەگەز)، کە جیهانی بابەتی وەك جیهانێك کە یاسا بەرێوەی دەبات، پێکیدێنن لە ئارا دا نییە، بەڵکوو تەواوی واقیعییەت لە وێنەی یەکخەری ماددی و هەست پێکراودا دەتوێتەوە. لە مەعریفەی زانستیدا، تەنیا پاش ئەوەی کە بە پێی ڕوانگەی رەخنەگرانە، توخمەکان لەیەکتر جیاکرانەوە و تاك تاك دەست نیشان کران، لێکدەدرێن. بەلاّم ئوستووره هەرچی بە دەستی بێنێ ـــ بە بێ هەڵسەنگاندنی و دەست نیشان کردنی ـــ لەگەڵ توخمەکانی دیکەدا لێکیان دەدات. ئەو شت یان ڕووداوانەی کە بە شێوەی ئوستوورەیی



لێکدەدرێن، چ لە ڕووی نزیکبوون یان لە باری فەزا یان بەدوایەکدا هاتنی زەمەنییەوە بێت، چ لە ڕووی وێکچوون یان ئەندامەتییان لە یەك چین یان چەشنەوە بێت، جیاوازیی تایبەتیی خۆیان لە دەست دەدەن و هەموویان دەبنە تاکە زات یان سروشتێك.

ئەم دۆخە لە هەموو مەقوولەکاندا دەبینرێ؛ بۆ نموونە لە مەقوولەی چەندێتی دا، هەروەك چۆن پێشتر گوترا، هزری ئوستوورەیی لە نێوان گشت پاژەکانیدا جیاوازی دانانێ. سێبەری کەسێك، جلك، نینۆك یان تاڵە موویەکی ئەو لەگەڵ خۆیدا یەکن و لە مەقوولەی چۆنێتی دا، هزری ئوستوورەیی لە نێوان مادە و ڕەواڵەت (عرض)ەکانی و لە نێوان شت و تایبەتییەکانیدا جیاوازی دانانێ، تایبەتمەندی یەك شت، پێناسە کردنی لایەنێکی ئەو شتە نییە، بەڵکوو دەربڕی گشت شتەکەیە. شتێك تایبەتمەندی جۆراوجۆری نییە، بە پێچەوانەوە هەرتایبەتییەك بوونێکی ماددی هەیە. مرۆڤێك کە دلێر یان قسەزانە، ئەم سیفاتەی وەك هێندێ جەوهەری ماددی تێدایە کە دەکرێ ئەوانەی لێ بڕیفێندرێ و بدرێ بە کەسانی دیکە. چەمك و باوەڕەکانیش بوونێکی مادییان هەیە. لە هێندێ عەشیرەتدا، ئەگەر باوەڕەکانی تاکێك لە ڕوانگەی تاکەکانی دیکەی عەشیرەتەکەوە بە ناپەسەند و پووچ دابنرێن؛ هەر بوونی ئەو باوەڕانە لەو کەسەدا دەبێتە مایەی «گلاّوی» ئەو کەسە و تەنانەت ئەگەر کەسانی دیکە دەستی لێدەن، ئەوانیش گلاّو دەبن و بۆسڕینەوەی بەرێوە بردنی هێندێ ڕێوڕەسمی ئایینی زۆر پێویستە، لە میسری کۆندا چەمکی « داد » یان « ئینساف»، بە « معات» ناو نرابوو. دەمی پاشاکان پەرستگەی (معات) بوو، و(معات) لە شێوەی خوایەکی

ماددیدا دەردەکەوت، بەلاّم لە هەمان کاتدا دەگوترا کە خواکان بە هۆی (معات)ەوە دەژین ».

ئەم چەمکە، بە تەواوی بە شێوەی ماددی و هەستپێکراو دەنوێندرا، واتە لە بۆنەی ئایینی رۆژانەدا وێنەی خوای ماددە (معات) وێڕای دیاردەی دیکە پێشکەشی خواکان دەکرا. لە بۆچونی هزری ئوستوورەییەوە، مەرگ ڕوداوێك نییە. واقیعییەتێکی ماددی هەیە. لە دەقی ئەهرامی میسردا کە وەسفێکی تەکوینی شتەکانە بەمجۆرەی خوارەوە هاتووە :

*ئەو کاتەی ئاسمان هیشتا نەهاتبوە ئاراوە،*
*ئەوکاتەی مرۆڤەکان هێشتا هەنگاویان نەنابووە ناو بوونەوە ،*
*ئەوکاتەی کە هێشتا خواکان لە دایك نەببوون،*
*ئەو کاتەی کە هێشتا مەرگ بە دی نەهاتبوو.*

لەو دەقەی سەرەوەدا جەخت دەکرێ کە ژیان لە خۆیدا نەمرە، تەنیا دەست تێوەردانی تومخێکی دیکە، واتە مەرگ کۆتایی پێ دێنی ٌ.

ژیانیش لە حەماسەی *گیل گەمیش*دا واقیعییەتێکی ماددی هەیە، *سی دوری* لە خەم و حەسرەتی گیل گەمیشدا دەڵێ ٌ :

*گیل گەمیش بۆ کوێ دەڕۆی ؟*
*ئەو ژیانەی بە دوایدا وێڵی هەرگیز نایبینی*
*چونکە ئەو کاتەی خواکان مرۆڤیان ئافراند*
*مەرگیان پێ بەخشی و ژیانیان لە دەستە کانی خۆیاندا را گرت.*

لێرەدا دەگوترێ کە ژیان شتێکی ماددی و هەست پێکراو (ملموس)ە وخواکان« لە دەستەکانی خۆیاندا رایانگرتووە ». گیل گەمیشیش بەدوای



دۆزینەوەی « گیای ژیان »دا دەگەڕا تاکوو بە خواردنی ژیانێکی هەرمانی بێت.

گوتمان کە ناوی کەس لەگەڵ کەسەکە خۆیدا یەکە وهەروەها گوتمان کە هزری ئوستوورەیی لەنێوان بۆنە ئایینییەکان و رێورەسمەکان و واقیعییەتی بابەتییانەدا جیاوازی دانانێ. هێندێ گۆزەی گڵ لە سەردەمی پاشاکانی میسری ناوەراست بەجێ ماون کە میسرییەکان ناوی عەشیرەتەکانی دوژمنی خۆیانیان لە *فەلەستین، لیبیا* و *نوبیا وتەنانەت* ناوی فەرمانرەواکان و هێندێ لەیاغییەکانیشیان لەسەر نووسیون. میسرییەکان ئەم گۆزانەیان بە شکۆیەکی تایبەتەوە لەهێندێ بۆنەی تایبەتدا ورد دەکرد (رەنگبێ لەبەخاك سپاردنی پاشاکانی پێشوودا).

مەبەست لەبەرپاکردنی ئەم رێورەسمانە ئەوە بوو، ئەو دوژمنانەی فیرعەون بەئاشکرا دەستی پێیان رانەدەگەیشت، لەناوبچن. ئەگەر رێورەسمی شکاندنی گۆزەکان بەرەمزیی دابنێین، خاڵی سەرەکی رێورەسمەکەمان درك پێنەکردووە. میسرییەکان پێیانوابوو بە لەناوبردنی ناوی دوژمنەکانیان زەبرێکی واقیعییان لێداون. ئەم بەزمانە بەم مەبەستەش بەرێوە دەچوون کە تەلەسمی پیرۆزێتی بە پانتایەکی کاریگەریی زیاترەوە بخەنەکار. دوای درکاندنی ناوی ئەودوژمنانەی «دەبووبمرن»، ئەم دەستەواژانەیان دەخوێندەوە :

*هەموو هزرە زیانبارەکان، هەموئاخاوتنەزیانبارەکان، هەمووخەونە زیانبارەکان، هەمووپلانە زیانبارەکان، هەموو ململانێ زیانبارەکان.*

و لەو دەمەدا وەردەبوونە شکاندنی گۆزەکان، میسرییەکان لەسەر ئەو باوەڕە بوون کە بە گوتنی ئەم دەستەواژانە بەرانبەر بە گۆزەکان و پاشانیش

وردکردنیان، دەسەلاٚتی واقیعی دوژمنەکانیان بۆ زەبرلێدان لە فیرعەون یان لاوازکردنی دەسەلاٚتەکەی لە ناودەبەن.

گوتمان کە هزری ئوستوورەیی جیاوازییەك لەنێوان وێنەی کەسێك وخودی کەسەکە دانانیٚ؛ چونکە لە درك پێکردنی «ئایدیال » یان چوارچێوەدا داماوە. میسرییەکان لەکۆندا وێنەی خوای مێینەی ***نوت*** یان، کە شوێنەکەی لەئاسماندا بوو و ئەرکی ژیان ئەستێنی لــەئەستۆ بوو، لە تابووتەکانی خۆیاندا دەنەخشاند. لەشی بیٚ رۆحی ناو تابووتەکە دەکەوتە دەستەکانی «نوت» ەوە، هەربۆیە هەلٚکشانی مردوو بۆئاسمان براوە بووە.

### ***٢- هۆبەندی (علیت):***

هزری ئۆستوورەیی بەو بیرۆکەیەی کە لە بارەی بابەتییەوە هەیەتی و لە هزری زانستی جیای دەکاتەوە، هەمان بیرۆکەشی بەهەمان رادە بەرامبەر هۆبەندی هەیە؛ چونکە چەمکی بابەتی وچەمکی هۆبەندی یەکترمەرجدار دەکەن. چوارچێوەی هزری هۆبەندی، چوارچێوەی هزری بابەتیی دیاری دەکات و بەپێچەوانەوە، چوارچێوەی هزری بابەتی چوارچێوەی هزری هۆبەندی دیاری دەکات. زانست ئاوێتەیی وتێکەلٚ پێکەلٚیی و تێگەیەشتنی هەستییانە بەنەزم و ریزبەندییەك دەگۆڕیٚ کە تێیدا رووداوی وەك یەك، بەپێی یاسای گشتی روودەدەن. ئامرازی ئەم گۆڕینە هۆبەندییە. هزری ئوستوورەیی بەشێوەیەکی سروشتی پێوەندیی هۆ و بەرهۆ دەناسیٚ؛ بەلاٚم روانینی ئێمە بەرانبەر بە ئەرکی هۆبەندی، وەك کارێکی تاکەکەسی، میکانیکی ویاسایی،



درك پیٚ ناکات. لە راستیدا چەمکی هۆبەندی یەکێك لەکۆلٚەگەکانی هزری ئوستوورەییە وجیهانی دیاردە ئوستوورەییەکان شایەتی ئەم بۆچوونەیە. ئەم جیهانەی دیاردەکان دەیهەویٚ لەرێگەی ئەفسانە ئوستوورەییەکانەوە، کە بەگشتی خەسلەتێکی روونکردنەوانەیان هەیە، وەلاٚمی پرسی سەرچاوەی جیهان وسەرهەلٚدانی خواکان بداتەوە ودەشیهەوێت بۆسەرهەلٚدانی هێندیٚ دیاردەی وەك رۆژ، مانگ، مرۆڤــ وهێندیٚ لەجۆرەکانی زیندەوەران و گژوگیا «روونکردنەوە »یەکی هەبێت. ئەو ئوستوورانەی لە بارەی دۆزینەوەی ئاگر، سەرهەلٚدانی خەت و فێرکردنی هونەری جوتیاری و شێوەی ئامادەکردنی جل و بەرگ و شێوەی دروست کردنی خانوو و ئەو جۆرەشتانەیە سەر بەم گرووپانەی ئوستوورەکانن. چونکە ئەم ئوستوورانە میراتی کولتووریی بەدەستکەوتی قارەمانان یا رزگاریدەران (وەك جەمشید، تەهمورس، هوشەنگ وفەریدون لە ئوستوورە ئێرانییەکاندا) دەزانن. بەلاٚم جیاوازی نێوان هۆبەندیی ئوستوورەیی و هۆبەندیی زانستی دەگەڕێتەوە بۆ بەرانبەرکیٚ (تقابل)ی چەمکی بابەتی لە هزری ئوستوورەیی و هزری زانستیدا. بەپێی بوچوونی کانت، بنەمای هۆبەندی بنەمایەکی لێکدراو(ترکیبی )یانەیە بۆ دەربڕینی دیاردەکان، واتە لەم رێگەیەوە دەکریٚ دیاردەکان بە شێوەی ئەزموون بخوێندرێنەوە. بەلاٚم ئەم لێکدانە هۆییە (علّی)، وەك ئەولێکدنەی کە لەچەمکی بابەتێتیدا دروست دەبێت، پێویستیی بەشیکردنەوەیەکی تایبەتییە. دیسانەوەش لێرەدا لێکدان وشیکردنەوە لازم و مەلزوم و تەواوکەری یەکترن. ناتەواویی بنەڕەتیی دەروونناسیی هیوم و رەخنەگرتنی لە چەمکی هۆنەبەندی، ئەوە بوو کە بابەتی شیکاریی (بەر لە هاتنە ئارای

پێوەندیی هۆیی) نەناسی. بەپێی بۆچوونی هیوم، هۆبەندی بە پێی نزیکیی دووشت (یان دوو ڕووداو) لە شوێنێکدا یان بەپێی ڕیزبوونی زەمەنیی پەیدا بوونیان بەدوای یەکتردا دێتەئاراوە. کاتێ کە دووشت یان دوو ڕووداو چەند جاران وێکڕا دەرکەون، سەرەنجام، بە ناوبژیکاریی «خەیاڵ »، پێوەندیی نزیکیی فەزایی و ڕیزبوونی زەمەنی دەبێتەوە بە پێوەندییەکی هۆیی وبەرهۆیی. بە واتایەکی دیکە، ئەگەر دووشت یان دوو ڕووداو لەپەنا یەکتر لە فەزادا، یان بەدوای یەکتر لە زەمەندا دەرکەون، ئاگایی ئێمە یەکەمیان بە «هۆ» و دووهەمیان بە«بەرهۆ» دادەنێ. بەلاّم ئەم جۆرە لەهۆبەندیی، کەهیوم سەرچاوەکەی دۆزیوەتەوە، لە واقیعدا هۆبەندیی ئوستوورەییە نەك هۆبەندیی زانستی. (لەوانەیە ئاماژە بەم خاڵە لێرەدا لەخۆڕا نەبێت کە پێوەندیی هۆیی کە مارکس لەنێوان دیاردە کۆمەلاّیەتییەکاندا دایدەمەزرێنێ ڕاست پێوەندییە هۆییە ئوستوورەییەکەیە ).

مەعریفەی زانستی، چەمکی هۆیی وئەحکامی خۆی ڕاست لە ڕێگەی پرۆسەیەکی بەرانبەردا لەگەڵ ئەوەی هیوم وەسفی دەکا، بەدەست دێنێ. ئەم چەمك وحوکمانە، ئەو ناوەرۆکانەی کە لە ژێر کاریگەریی هەستیپیانەی ڕاستەوخۆدا لەیەکتر نزیکن، لەیەکتر جیا دەکەنەوە و پاشان شییان دەکەنەوە و لەگەڵ بارودۆخی ئاڵۆزی جۆراجۆردا گرێی دەدەنەوە. لەدرك پێکردنی هەستیپیانەی تۆخدا، بەدوای دۆخی تایبەتی A لە ساتەوەختی A1 دا دۆخی B لە ساتە وەختی A2 دێت. بەلاّم بە چاوپۆشی کردن لەمە کە ئەم بەدوای یەکتردا هاتنانە زۆرجار چۆن دووپات دەبنەوە، ئەم بەدوای یەکتردا هاتنە زەمەنییە لەخۆوە ناگا بەم بیرۆکەیە کە A «هۆ»ی B یە , مەگەر ئەوەیکە



چەمکێکی ناوبژیکارانە بێتەئاراوە و دەوری هەبێت. هزری زانستی لەدۆخی A دا کارای تایبەتی (ئالفا)جیادەکاتەوە وبەکارای (بێتا) وە لەB دا دەیبەستێتەوە. ئەم بابەتە کە ئالفا و بێتا لەبەرامبەر یەکتردا لە پێوەندییەکی زەروریی واتە پێوەندیی ***هۆ*** و ***بەرهۆ*** یان ***مەرج*** و ***بەرمەرج دا*** دێن، بەشێوەیەکی پەسیڤ (انفعالی) لەچەند درك پێکردنێکی هەستی بەدەست نایە.

زانست ئەم حوکمە سەر لەنوێ تاقی دەکاتەوە؛ واتە بەدانانی «مەرج» یان هۆی گریمانەکراو، دەبێ هۆبەندیی پێوەندیدار، بەوەوە دەرکەوێ. تاقی کردنەوەی فیزیکی ،کە (احکام علّی) لەئاکامدا بەوانەوە بەندن، بەردەوام لەسەرشیکردنەوە و لێکدانەوەی دیاردەیەك بەبارودۆخی جۆراوجۆر و بە توێژاڵی جۆراوجۆری ڕێژەکان و پێوەندییەکانەوە بەندە، ڕووداوێکی فەزایی زەمەنی کە لە سەرەتادا بەشێوەی کاریگەریی هەستیانەی تۆخ هاتبووە ئاراوە، لە ڕێگەی شیکردنەوەی بەردەوام، واتایەکی نوێ دەدات کە مۆرك و نیشانی ڕووداوێکی هۆبەندیانەی پێوەیە. ئەورووداوە تایبەتە ئیتر تەنیا ڕووداوێکی بچووك نییە، بەڵکوو دەبێتە ئامرازی گواستنەوە و دەربڕی یاسایەکی گشتی وجیهانگیرە. گیرانی ماسولکەی لاقی بۆق لە ***تاقیگەی گاڵوانی*** دا، لە خۆوە وەك ڕووداوێکی شینەکراوە، هێزی نوێی گاڵوانیزمی نەدەسەلماند. « گاڵوانیزم» کە لەڕێگەی پرۆسەیەکی شیکاریی مەنتیقی یەوە، پێوەندیی بەگیرانی لاقی بۆقەوە بوو، چەسپا. پێوەندییە هۆیی و بەرهۆییەکان وا زانست لەنێوان دیاردەکاندا دایدەمەزرێنێ، تۆمارکردن و دووبارەبوونەوەی زانیارییە هەستییەکان و ئەزموونییەکان نییە، بەڵکوو

بەپێچەوانەوە، پێوەندیی هۆبەندی، نزیکایەتیی تۆخی ئەزموونییانەی توخمەکان تێکدەدات؛ واتە ئەو ناوەرۆکانەی کە لە بوونی ئەزموونیدا لە پەنا یەکتردان، بە پێی «بنەچەك» و« زات» لەیەکتریان هەڵداوێرێ و ئەو توخمانەی کە لە روانگەی کاردانەوەی هەستیی راستەوخۆدا لە یەکتر دوورن، بۆ رۆنانی چەمکیانەی واقیعییەت، لە یەکتر نزیك دەکاتەوە و پێوەندیان دەدات. نیوتۆن هەر لەم رێگەیەوە توانی یاسای راکێشانی گشتی (جاذبەی عمومی) دەربخات. ئەو سێ گرووپی لە دیاردەکان کە لەروانگەی تاقیکردنەوەی هەستییەوە بەتەواویی لەگەڵ یەکتردا دوور بوون، پێکەوە پێوەند دا: (١) *کەوتنە خوارێی شتەکان* (٢) *گەڕانی هەسارەکان لە سەر مەداری هێلکەیی بەدەوری رۆژدا* (٣)*بەنۆرەهاتنی هەڵکشان وداکشانی ئاوی دەریا*.

هزری ئوستوورەیی بەشێوەی رووت کارابییەکی تایبەت لە گشتێکی ئاڵۆزەوە وەك « مەرج » یان« هۆ » دەردەکێشێ و بۆ ئەم کارەش لە جیهانی کاریگەریی هەستیی راستەوخۆ دووردەکەوێتەوە، کەچی هزری ئوستوورەیی لە دیلێتی جیهانی دیاردەکاندا دەمێنێتەوە. لەم رووەوە ئەگەر دوو شت یان دوو دیاردە لە یەك شوێندا لە پەنا یەکتردا دەرکەون یان لە بواری زەمەنییەوە بەدوای یەکتردا بێن، هزری ئوستوورەیی یەکیان بە «هۆ» و، ئەوی دیکەیان بە «بەرهۆ» دادەنێ. بۆنموونە ئەو زیندەوەرانەی کە لەوەرزێکی دیاریکراودا دەبینرێن، بەگشتی وەك بەدی هێنەران و« هۆ »ی ئەو وەرزە لەبەر چاودەگیرێن. لەئاگایی ئوستوورەییدا، ئەمە پەرەسێلکەیە کەهاوین دێنێ. لەبیرۆکەی ئوستوورەییدا، یەك گشتی ئاڵۆز لە بەشە وردەکان پێك نەهاتووە



بەڵکوو گشتێکی جیانەکراوەیە. ئەم گشتە ناکرێ کەرت بکرێ بۆ توخم یا کارای جیا لەیەکتر، بە تایبەت بابەتی بوون و زەینی بوون. ئەرکی چەمکی زانستییانەی هۆبەندی تەنیا لێکدان یان پێوەنددانی ئەو توخمانەی کە لە تێگەیشتنی هەستیدا ئامادەن نییە، بەڵکوو، بەپێچەوانەوە، یەکەمین ئەرکی، دەست نیشان کردنی ئەم توخمانەیە. تا ئەو کاتەی ئەم توخمانە دەست نیشان نەکرابن، زانستی ئەزموونی ئامرازی پێویستی نییە بۆ جیاکردنەوەی توخمە جوراوجۆرەکان و جیاکردنەوەی هەرێمی شتەکان. و لە ئاکامیشدا هەر جۆرە ئەنجامگیرییەکی هۆیی نامومکین دەبێ.

لە حاڵێکدا هزری زانستی هەر لە بنەڕەتدا بە دوای دامەزرانی پێوەندییەکی روون و براوەی نێوان «هۆی» تایبەت و «هۆبەندی» تایبەتەوەیە؛ هزری ئوستوورەیی ئەگەر لە سەرچاوەی شتێکیش بکۆڵێتەوە خۆی بە ئازاد دەزانێ کە لەو چەندین «هۆ»یەی بە بیریدا دێت، یەکێکیان هەڵبژێرێ، چونکە لەم هزرەدا هەرشتێك دەتوانێ سەرچاوەی هەرشتێکی دیکە بێت، چونکە هەر شتێك دەتوانێ لە پێوەندییەکی شوێنی یا زەمەنیدا لەگەڵ هەرشتێکی دیکە دا بێت. هزری زانستی، واقیعی گۆڕان تاوتوێ دەکات؛ بەلاّم لە بنەرەتدا کاری بە گۆڕانی شتێك بە شتێکی دیکە نییە و ئەم گۆڕانە تەنیا لە کاتێکدا بە گونجاو دەزانێ و پەسندی دەکات کە دەربڕی یاسایەکی گشتی بێت و لە سەر ئەرك ( فونسکیونل) وئیرادەی (دێترمنیان)ی دەست نیشان کراو دامەزرابێ. ئەو ئەرك و ئیرادەیانەی کە بکرێ لە « ئێرە» و« ئێستا » و شتەکانی هەبوو وا لە « ئێرە » و « ئێستا »دا هەن، بە جۆرێك بە سەربەخۆ بزانرێ. بە پێچەوانەوە، گۆڕانی ئوستوورەیی بەردەوام

شتێکی جیا لە تۆمارکردنی تاکە ڕووداوێك نییە، گۆڕانی مادەیەکی هەست پێکراو ( ملموس ) و تاقانە بە مادەیەکی هەست پێکراو و تاقانەی دیکەیە. بۆنموونە لە هێندێ ئوستوورەدا هاتووە کە کاکەشان وەك ماسی لە قولاّیی دەریاکانەوە هاتە سەرێ یا لە قالبی کیسەلێك دروست کراوە. زەوی لە جەندەکی زیندەوەری مەزن و رۆژ لە بەردێکی گەورە پێکهات. مرۆڤــ لە تەختە بەرد یا لە درەخت ئافرێنراوە. هەموو ئەم دەربڕینە ئوستوورەییانە کە لە ڕەگەزی جیاواز و ئالۆز و بێ یاسا و ڕێسا دێنە بەرچاو، تاکە ڕێگە چارەیەکە، وا پیشانی جیهان دەدەن. کەچی بڕیاری زانستی، دیاردەیەك بە توخمی بەردەوام کەرت دەکات و هەوڵ دەدات لە ڕێگەی سەرلە نوێ لێکدانی ئەم توخمانە و کاریگەری بەرانبەریان و پێوەندیی بەردەوامیانەوە تێیان بگات؛ هزری ئوستوورەیی بە ( گشت)ی جیانەکراوەوە دەنووسێ و خۆی بە وێنا کردنی ڕەوتی ئەوشتەی ڕووی داوە رازی دەکا. لەوانەیە لەم ڕەوتەدا هێندێ شت دووپاتە ببنەوە؛ بەلاّم لە هزری ئوستوورەییدا جێگەیەك بۆ پشکنینی ڕێسا یان بارودۆخی وێنەییانەی سنووردارکەر و جیاکەرەوە لە ئارادا نییە.

لەوانەیە دەربڕینی ئەم باسە بە دژە گوتنێك ئاوێتە بێت کە هزری ئوستوورەیی پتر لە هزری زانستی بە بنمای هۆبەندی پێبەندە، هزری ئوستوورەیی هەرگیز قبووڵ ناکات کە ڕووداوێك لەوانەیە لە خۆوە و بە «سودفە» روو بدات. ڕوودانی کارەساتێکی سروشتی وەك بومەلەرزە، نەخۆشی یا مەرگ هیچ کات « بە سودفە » نییە، بەڵکوو هۆ واقیعییەکانیان سێحرە؛ بە تایبەت مەرگ هیچ کات لە خۆوە روو نادات



بەڵکوو لەبەر سێحری دوژمن دێتە ئاراوە. بۆ نموونە ئەگەر کەسێك بە زەبری نێزە کوژرا، هۆی واقیعی مەرگی ئەو کەسە برینی نێزەکە نەبووە، بەڵکوو سێحری دوژمن بووە.

لێرەدا دووبارە دەبینین کە بنجی جیاوازیی و بەرانبەرکێی هزری ئوستوورەیی لەگەڵ هزری زانستیدا، فۆرمی تایبەتی دەربڕینی هۆیە نەك چەمکی هۆبەندی. ئاگایی چەمکی و ئاگایی ئوستوورەیی ئەهرۆمی دەربڕین، لە شوێنی بە تەواوی جیاوازدا دادنێن. زانست بەمە رازی دەبێت کە ڕووداوێکی تاقانە لە فەزا و زەمەندا وەك دانەیەك لە یاسایەکی گشتی تێبگات. بەلاّم ئیدی ناپرسێ بۆچی «ئەم» ڕووداوە لە «ئێرە» و «ئێستا» ڕووی داوە ؟ بە پێچەوانەوە، ئاگایی ئوستوورەیی هەر ڕووداوێك بە تاقانە دادەنێ و بەمجۆرەی « دەردەبڕێ » کە ڕووداوی تاقانە بە هۆی « ئیرادەی » یەك کەسەوە ڕووی داوە. واتە کاتێ بە دوای هۆیەکدا دەچێت، بۆ بەدەست هێنانی « بۆچی / لەبەرچی » نییە، بەڵکوو بەدوای «کەس» ەوەیە. چونکە لە روانگەی ئەوەوە جیهانی دیاردەکان وەك « تۆ » یە؛ کەواتە نایهەوێت کە یاسای گشتی بدۆزێتەوە تاکوو پرۆسەکە بخاتە ژێر ڕێسا و پێڕەوەوە. ئەگەرچی چەمکە هۆییە زانستییەکان بەدوای تێگەیشتن و دەست نیشان کردنی بابەتی تایبەتەوەن وبەم مەبەستەش، پڕژمار و جیاواز و تەواوکەری یەکترن، یەکتریش دەست نیشان دەکەن، سەرەرای ئەمانەش بەردەوام هەرێمێك بۆ دەست نیشان نەکراویی چەند بوارێکی بابەتی تایبەت لەبەرچاو دەگرن. چوونکە چەمکەکان بە پێی سروشتی رووت(ئینتزاعی) و ئایدیال (نموونەیی) یان ناتوانن هەموو بوارەکانی دیاردەیەك یان شتێکی مەلمووس دەربڕن لەم

رووەوە بۆ تاوتوێی کردنی یەك دیاردە یان یەك شت دەبێ بارودۆخەکەی، هێندێ تەعدیل بکرێ تاکوو ببێتە بەشێك لە یاسایەکی گشتی، زانست هەر دیاردەیەکی وردو پاژییانە دەباتە ژێر سایەی بابەتێکی گشتییەوە؛ بەلاّم ناتوانێ لە ئەنجامدا تەنیا لەم بابەتە گشتییە بگا، بەو حوکمە ورد و پاژییانەیە. تەنانەت « یاسا تایبەتیەکانی سروشت » یش شتی نوێ و تایبەت ئاراستە دەکەن کە لە بەرانبەر بنەمای گشتی هۆبەندیدایە. ئەگەرچی ئەوانە ملکەچی بنەمای هۆبەندین و لە ژێر دەستی ئەودان. بەلاّم بنەمای هۆبەندیی ناتوانێ هاوکێشەی هەست پێ کراوی ئەوان دابنێ و ناشتوانێ دەست نیشانی بکات.

لێرەدا هزری ئوستوورەیی و زانستە سروشتییەکان لەگەڵ پرسی «دیاردەی سوتفە» (لەناکاو) (Accidental) بەرەوروو دەبن. لەم پێوەندییەدا «دیاردەی سودفی » بە واتای لادان لە یاسای گشتی نییە بەڵکوو بەم واتایەیە، کە گەرچی « دیاردە سودفی » بە تەعدیلی ئەم یاسایەوە بەستراوە، بەلاّم تەنیا لەوەوە هەڵناهێنجرێ. ئەگەر هزری تیۆری زانستی بیهەوێت بە شێوەیەك ئەم تومخە، لە روانگەی یاسای گشتی هۆبەندییەوە کە « دیاردەی سودفییە» ، درك پێبکات و دەست نیشانی بکات، هەروەك چون کانت لە بەرهەمەکەی **رەخنەی هێزی دادوەری دا** بە وردی دەری بڕیوە ،دەبێ دەستەو داوێنی مەقولەیەکی دیکە بێت و بنەمای هوبەندی تۆخ (**محض**) ئێستا جیگەی خۆی بۆ بنەمای غایەت ( یان ئامانج) چۆل بکات. ئەوەی پێمان وابێت ئامانج و غایەتی هەیە لە واقیعدا یاسامەند کردنی «دیاردەی سودفی » یە.



بەلاّم ئوستوورە لە هەمان سەرەتاوە، سەرهەڵدانی هەردیاردەیەك بە ئامانجدار دەزانێ کە بە پێی کردارێکی ئیرادەییانەی خوا یان دێوێك ڕوو دەدات و لە سەر ئەو باوەڕەیە هێزە سروشتییەکان شتێکی جیا لە دەربڕینی ئیرادەی خواکان یا شەیتان نین. ئەم بنەمایە بۆ هزری ئوستوورەیی سەرچاوەی نوورێکە رووناکی بەگشت واقیعییەت دەبەخشێ و بە بێ ئەوە جیهانی بۆ مومکین نییە. بۆ هزری زانستی « تێگەیشتن » لە رووداوێك شتێکی جیا نییە، لە گۆرینەوەی بە هێندێ بارودۆخی گشتی و بردنە ژێر یاسا و بارودۆخی ئاڵۆز و جیهانگیرەوە، کە بە « سروشت » ناو دەبرێ. بۆ نموونە رووداوی مەرگی مرۆڤێك کاتێ درك پێدەکرێ کە بتوانرێ لەم کۆمەڵە بارودۆخ و یاسایانە پێگەیەکی پێ بدرێ؛ بە واتایەکی دیکە، بە پێی بارودۆخی فیزیۆلۆژی ژیان، بکرێ مەرگ وەك دیاردەیەکی پێویست و ئیجباری دابنرێ. بەلاّم ئەگەر ئوستوورە پێویست بوونی « پرۆسەی جیهانگیری سروشت » بەراست دابنێ، دیسانیش ئاگایی ئوستوورەیی، مەرگ بە « بابەتێکی لە خۆوە » دەناسێ. چونکە ئەم دەربڕینە زانستییە ئەوەی مایەی سەرنج و حەزی هزری ئوستوورەییە، روون ناکاتەوە؛ واتە ئەم خاڵە کە بۆچی « ئەم » کەسە دەبێ لە « ئێرە »و « ئێستا » بمرێ ؟ کە واتە مەرگی ئەم کەسە رووداوێکی تاقانەیە و تەنیا لە کاتێك دا شیاوی تێگەیشتن دەبێ کە بە شتێکی تاقانەی دابنێین، واتە بە کرداری ئیرادی کەسێکی دیکەی بزانین. بەلاّم ئوستوورە بۆدەست نیشان کردنی رووداوەکان، ئەوان بە ئازادیی کرداری کەسێکەوە گرێ دەدات. ئەگەر ئاوی رووبارەکە زیاد ناکات، لەروانگەی هزری ئوستوورەییەوە نەبارینی باران لە چیا دووردەستەکانەوە

هۆی ئەم « بەلاَ »یە نییە، بەڵکوو لەبەر ئەمەیە کە ئاوی رووبارەکە «نایهەوێ » زیاد بکات. رووبار یان خواکان بەدڵنیاییەوە لەدەست ئەوخەڵکانەی کەژیانیان بەزیادبوونی ئاوی رووبارەکەوە بەندە تووڕە بوون وبەمجۆرە دەیانهەوێ پەیامێك بە خەڵك بگەیەنن. دەزانین کاتێ ئاوی دیجلە زیادی نەدەکرد ***گورئای پاشا*** لە پەرستگەدا دەخەوت تا لە خەونیدا لەواتای وشکە ساڵی تێبگات.

لە میسر لە سەردەمانی زۆر زووەوە بالأی ئاوی رووباری نیلیان هەموو ساڵێك تۆماردەکرد، بەم پێیە هەمووساڵێك، کاتێ ئاوی رووبارەکە دەبوو بێتە سەرتر، فیرعەون چەند قوربانیی و دیارییەکی پێشکەشی رووبارەکە دەکرد. وێڕای ئەم قوربانیی و دیارییانە، کە فڕێ دەدرانە ناو نیل، بەڵگەنامەیەکیش لەئارادا هەبوو کەتێیدا پەیمانەکانی (نیلیان) بەشێوەی فەرمان یان پەیمان، تێیدا گونجاند بوو.

هزری ئوستوورەیی بۆ دەربڕینی مەسەلە کۆمەلأیەتییەکانیش ئەم شێوەیە بەکاردێنێ. تەنانەت کاتێ مارکسیزم وادەنوێنێ کە باوەڕی بە ئەم جیهانە و بە زانست هەیە، ئەوساش ناتوانێ جیا لەچوارچێوەی وێنە وململانێی نێوان «باش» و «خراپ»دا بیربکاتەوە. لێرەشدا هزری ئوستوورەیی بۆ «دەربڕین» ی هەر رووداوێکی کۆمەلأیەتی، بەدوای «چۆنێتی» روودانی و بەستراوێتی و پێوەندێتی ئەو بەپێکهاتەی ئەو کۆمەڵگەیە و باری رابردوو وئێستایەوە نییە، بەڵکوو بەدوای «کەس»ەوەیە: ئاخۆ بە ئیرادەی زل هێزی رۆژهەلأت روودەدات یان بە ئیرادەی سیحربازی رۆژئاوا ؟ لەم نموونەیەشدا خەسلەتی



ئوستوورەیی « دەربڕین »ە مارکسیستی - لنییستی یەکان بەتەواوی ئاشکرا دەبێت.

لە پێوەندی لەگەڵ چوارچێوەی هۆبەندیی ئوستوورەییدا، لەگەڵ خەسلەتێکی دیکەی جیهان بینی ئوستوورەیی بەرەوروو دەبینەوە کە بەردەوام جەختی لە سەر کراوەتەوە وئەویش بریتییە لە پێوەندییەك کە ئوستوورە لە نێوان گشتێتی شتێکی ماددی و پاژەکانی ئەو شتەدا وێنای دەکات. ئەگەر بە مێژووی زانستیدا بچینەوە تێدەگەین کە چەمکی هۆبەندی ومەقولەی گشت وپاژ (کل وجزء ) هاوشانی یەکتر گەشە یان کردووە؛ چونکە هەردووکیان سەر بە پرۆسەی شیکردنەوەن. هزری زانستی پێی وایە گشت لە پاژەکان پێکهاتووە و لەراستیدا لەرێگەی دەست نیشان کردنی ئەم پاژانەوەیە کە لە گشت تێدەگات. بەلأم بۆچوونی ئوستوورەیی، هەم لە هزردا و هەم لە کردەوەشدا، لەنێوان گشت و پاژەکانیدا هیچ جیاوازییەك دانانێ. گشت پاژی نییە و کەرت ناکرێ وبە سەر پاژەکاندا دابەش نابێ. پاژ راستەوخۆ گشتە؛ و ئوستوورەش لە سەر ئەم بنجە کار دەکات. لەروانگەی زانستەوە، گشت تەنیا کۆی پاژەکانی نییە، بەڵکوو لە پێوەندیی بەرانبەر ودوو لایەنەی پاژەکانی و پێوەندیی هەر پاژێك لەگەڵ گشتدایە. گشت بەواتای یەکێتی ئەم پێوەندییە داینامیکیانەیە کە هەر پاژێك تێیدا بەشدارە و لە بەرێوە بردنی کار و بارەکانیشدا پشکی هەیە. لێرەشدا هزری ئوستوورەیی بەرەو لایەکی دیکە دەڕوا وچونکە چوارچێوەی شیکاریی هۆبەندیی نییە، ناتوانێ لەنێوان گشت وپاژدا نێوانێکی جیاکەرەوە دیاری بکات؟ لەم رووەوە گشت وپاژەکانی پێکەوە ئاوێتە دەبن وچارەنووسی هەموویان پێکەوە دەبەسترێتەوە.

دەکرێ شێوەی کاری هزری ئوستوورەیی لە پێوەندی لەگەڵ فەزا و زەمەنیشەوە تاوتوێ بکەین. ئوستوورە شهوودی بەدوای یەکداهاتنی زەمەنی یان هاوزەمەنی بەپێی شێوەی بیرکردنەوەی خۆی دەئافرێنێتەوە.لە هەردوو دۆخدا هزری ئوستوورەیی شیکاریی ولێکدانەوەی واقیعییەت بەکارای پاژیی وسەربەخۆ لەیەکتر وشیکردنەوەش بە بارودۆخی پاژییانەوە کە سەرەتای دەست پێکردنی هزری زانستی وسیمای جیاکەرەوەی روانینێتی، دەخاتەلاوە. بەپێی ئەو بۆچوونەی کە بە بنەمای «جادووی هاودڵانە» دادەنرێ، لە نێوان هەموو ئەو شتانەی کە لە فەزادا لە پەنا ونزیکی یەکتر بوون یان لەیەك مادە پەیدا بوون، پێوەندییەکی گشتی یان هۆیی لە ئارادا هەیە. کەواتە ئەگەر کەسێك بەرماوی خۆراك یان ئێسکی ئەو گۆشتەی خواردوویەتی وەك خۆی بەجێ بێڵێ، مەترسی جیدی هەڕەشەی لێدەکات. چونکە هەر رووداوێك بۆ ئەوان بێتە پێشێ بۆ ئەو خۆراکەی لەشی ئەویش وەریگرتووە دێتە ئاراوە. دەبینین کە هزری ئوستوورەیی بەبێ سەرنجدان بە مەودای فیزیکی وشوێنی، پێوەندییەکی «هاودڵانە» لە نێوان پاژەکانی شتێکدا (لەنموونەکەی سەرەوەدا خۆراك )وێنا دەکات. ئەم پێوەندییە هاودڵانەیە، کەرت کردن و دابشکردنی ئەندامەکانی لەش بە پاژی جۆراوجۆرو دیاری کردنی ئەرکەکانیان بۆ خۆی و بۆگشتەکەش بەپێویست نازانێ. هەر پاژێك لە لەش بۆ نموونە نێنۆك یان تاڵەموویەك لەگەڵ ئەندامەکانی دیکەی لەشدا و لەگەڵ گشتیشدا هاوئاست وهاوکێشە. کاری ئەندامەکانی لەش بەپێی بارودۆخەکانیان دەست نیشان ناکرێ وئەرك ورۆڵیان پێناسە وپۆلین ناکرێ. هەروەك چۆن کە ئەندامەکانی لەش بەپێی کار و گرنگی خۆیان لەیەکتر جیانابنەوە، دەست نیشان کردنی



زەمەنی، واتە ساتە تایبەتە زەمەنییەکانی هەر پرۆسەیەکی بابەتیش بەپێی گرنگی هۆیی لە یەکتر جیاواز نابن. هێندێ جاریش لەنێوان هۆ و بەرهۆدا جیاوازییەك لە ئارادانییە و ئەم دووە دەتوانن جێگای یەکتر پڕبکەنەوە. ئەگەر شەرکەرێك بە نێزەیەك بریندار بوو، بۆهێورکردنەوەی ئێشی برینەکەی، مەلحەم لەنێزەکەی هەڵدەسوون یان ئەوەیکە نێزەکە لەشوێنێکی فێنکدا هەڵدەواسن !

لەروانگەی زانستەوە، شتێك هەرگیز بەسانایی نابێتە هۆی شتێکی دیکە؛ بەڵکوو کاریگەرییەکەی لەسەرشتی دیکە لەژێر بارودۆخێکی دیاری کراو و بەتایبەت لە ساتەوەختی بەتەواوی دەست نیشان کراودایە. پێوەندیی هۆ و بەرهۆ ئەوەندەش بەپێوەندیی نێوان شتەکان دانانرێ، بەڵکوو پتر بەپێوەندیی نێوان ئەو گۆڕانانە دادەنرێ کە لەنێوان شتێکی دیار و لەزەمەنی تایبەتدا دێتە ئاراوە. بە پێشکەوتنی زانست و لە رێگەی سەرنجدان بەم رەوتە زەمەنییەوە، پرۆسەی گۆڕان وکەرتەکردنی بە « قۆناغی » جۆراجۆر و بەتەواوی جیاواز و دەست نیشان کردنی هەر قۆناغێك لە پرۆسەکە، پێوەندیی هۆ و هۆبەند پتر لە پێشوو ئاڵۆز و ناراستەوخۆتر دەبێ. ئنجا ئیدی نێزە بەهۆی بریندارکردن دانانرێ؛ ئەوەی روودەدات ئەمەیەکە لەساتێکی دیاری وەك $t1$ دا نێزەکە بەلەشدا دەچێ وگۆڕانێکی بەرچاوی بەسەردا دێنێ. ئەم گۆڕانە لە زەمەنی $t2$ و $t3$ و... چەند گۆڕانێکی دیاری دیکەی ئۆرگانیزمی بەدوادادێت کە دەبێ هەمووی ئەوانە وەك بارودۆخی پێویست وتایبەت بۆ بریندار کردن لەبەرچاو بگیرێ. لەبەر ئەوەیکە ئوستوورە وجادوو لەهیچ شوێنێکدا لێکدانەوە وشیکردنەوەیەکی ئەوتۆ ناکەن، لەئاکامیشدا هیچ

لەمپەرێکی تایبەت لەنێوان پاژەکانی گشتێکی فەزایی یان زەمەنیدا نابینن. هەر لەم رووەوە جادووی هاودڵانە لەسەرووی هەمووجیاوازییەفەزایی و زەمەنییەکانەوە تێدەپەڕێ. بۆ نموونە جیایی فیزیکی یا فەزایی، پاژ لەگشت (وەك جیایی نینۆك یان تاڵەموو لە لەش ) نابێتە مایەی ئەوەی کە پێوەندیی هۆ و بەرهۆ لەنێوانیدا لاببات و بەم شێوەیە «بەرلە» و«دوالە» و «زووتر» و «درەنگتر»یش پێکەوە ئاوێتە دەبن. ململانێی نێوان ئەو توخمانەی لە بواری فەزایی و زەمەنییەوە لە یەکترجیان. لە پێناسەی «هۆبەندیی» جادوویدا دەتوێنەوە.

روانینی ماددی و هەست پێکراوی هزری ئوستوورەیی لەبارەی کردەشدا شایانی سەرنجدانە. شیکاریی مەنتیقی ــ هۆیی کردە لە بنەڕەتدا بەکەرت کردنی بە پرۆسەی سادە وجیاوە بەستراوە، بەڵام تەنانەت لەو شوێنەشدا کە روانینی ئوستوورەیی سەرنج دەداتە پرۆسەکە، بەدوای سەرچاوە وتەکوینەوەیە، وئەم « تەکوین »ە لەگەڵ مادەیەکی ئاسایی ومەملووسدا لەپێوەندی دایە. بەواتایەکی دیکە، ئوستوورە پرۆسەی (عمل) تەنیا وەك گۆڕانی مادەیەکی دیکە دەناسێ و تێیدەگا. لەشیکردنەوەی زانستیدا، رەوت بەردەوام لە « شت »وە بۆ « بارودۆخ »ولەدرك پێکردنی هەستیانە ومادییەوە بۆتێگەشتنی ئەرکییە (فونکسیونل )ە, بەڵام لە روانینی ئوستوورەیی وجادوویيدا، گۆڕان لە چوارچێوەی درك پێکردنی مادەی ئاساییدا قەتیس دەمێنێتەوە. پێناسەی زانستی هەرچەندی بچێتە پێشتر، خۆی پتر لەجاران بە توێژینەوە لە «چۆنێتی» گۆڕان وچوارچێوەی پێویستی ئەوەوە دەبەستێتەوە. بەڵام ئوستوورە تەنیا لەبارەی «لە کوێ» و«بۆکوێ»



دەکۆڵێتەوە و«لەکوێ» و«بۆکوێ» ش وەك شتە ماددی و هەست پێ کراوەکان سەیردەکات. هۆبەندی لێرەدا، پێوەندییەکی ناوبژیکارانە یان بوونێکی سەربەخۆ نییە کە بەدانانی خۆی لەنێوان توخمی تایبەتدا، شییان بکاتەوە یان لێکیان بدات.ئوستوورە پێیوایە گۆڕان، گۆڕانی شتێکی هەست پێکراو و ئاساییە، بەشتێکی ئاسایی و هەست پێکراوی دیکە. کەچی هزری چەمکییانە زنجیرەیەکی پێکەوەلکاوی رووداوەکان بە هۆ و بەرهۆ دابەش دەکات و بەمجۆرە شێوەی گۆڕان و یاسای ئەم گۆڕانە تاوتوێ دەکات. ئوستوورە ئەگەر بتوانێ سەرەتا و کۆتایی پرۆسەی گۆڕان بە روونی لەیەکتر هەڵاوێرێ، پێیوایە پێویستییەکەی دابین بووە. بۆ نموونە دەکرێ ئاماژە بەم باوەڕەی میسرییەکان بکرێ کە ئاسمان لە سەرەتاوە لە سەر زەوی پاڵی دابووەوە (دۆخی سەرەتایی ) تاکوو **شوو**[٦] خوای هەوا، ئەو دووەی لەیەکتر جیاکردەوە وئێستاش پەرژینی نیوانیانە (دۆخی کۆتایی ).میسرییەکان ئاسمانیان وەك ژنێك نیشان دەدا کە داهاتووەتەوە و دەستەکانی بەرەو زەوی کردووەتەوە و **شو** رایگکرتووە.

خەسلەتێکی دیکەی شیاوی سەرنجی هزری ئوستوورەیی بزێو(سیال)بوونێتی. بەم واتایە کە بۆ تاکە رووداوێك هۆی دژ بە یەك ئاراستە دەکات. بە واتایەکی دیکە هزری ئوستوورەیی باوەڕی بە بنەمای رەتکردنەوەی دژەگوتن نییە و دژەگوتن (تناقض) یەکێ لەخەسلەتە سەرەکییەکانێتی (ئەم بابەتە پێویستی بەباسێکی جیایە) بۆنموونە دەبینین کە لە ئوستوورەکانی میسردا، رۆژ بە یەکەمین پاشای میسر دادەنرێ (دۆخی سەرەتایی) بەڵام ئێستا لە ئاسمان جێگیر بووە (دۆخی کۆتایی). هزری

ئوستوورەیی دۆخی سەرەتایی و کۆتایی بەم جۆرە پێکەوە پێوەند دەدات کە *هەتاو – خودا* کە سەردەمێك پاشای میسر بوو و لە سەر زەوی ئامادە بوو لەچنگ مرۆڤ ماندوو بووە، کەواتە لە سەرمێیینە خوای ئاسمان دانیشت (نووت) و نووت خۆی بەشێوەی گایەکی زەلام دەرێنا ولەسەر زەوی نیشتەجێ بوو. لەوکاتەوە رۆژ لەئاسمانە. بەلاّم بەرلەمە دیتمان کە نووت، مێینە خوای ئاسمان، بەشێوەی ژنێك بووکە خوای هەوا (شوو) ئەوی لەئاسماندا راگرتبوو.

لەکاتێکدا هزری زانستی تێدەکۆشێ، گشت واقیعییەت بەچەندی کەرت بکات و لەم رێگەیەوە تێیان بگات؛ هزری ئوستوورەیی مەسەلەی سەرچاوەکان تەنانەت بەگۆڕینەوەی سیفەتە تۆخەکان، وەك گامەکانی مۆسیقا یان رێکخستنی کاسێتەکان (Castes)بە جەوهەری ماددی سەرەتایی، چارەسەر دەکات و لەبەر ئەم چوارچێوە سەرەکییەی هزری ئوستوورەیی، هەموو تایبەتیی و سیفاتەکە دەبێ لەئاکامدا پێناسەیەکی مادیان پێبدرێ. بۆنموونە جیاوازییەك لە نێوان برەهمەن (دیدەوانی زانستی پیرۆز ) وسپایی و«سودرا» (Sudra) = ( وەرزێران یان کرێکاران )دا تەنیا لە سەر ئەم گریمانەیە درك پێدەکرێ کە ئەوان جەوهەری مادیی جیاوازیان هەیە. واتە برەهمەن لە (سەر) یان (زاری) برەهما، سپایی لە باهۆ و ورەزێران و کرێکاران لە لاقەکانی «دروست» کراون. لە مارکسیزمیشدا «بورژوازی» سروشتێکی ئەهریمەنی هەیە و «پرۆلیتاریا» ئەهورایییە. ئەو یەکەیان جیهانی کردۆتە جەهەنەم و ئەم یەکەیان دەیکاتە بەهەشت. ئەگەر ژنێك نەزۆك بێت هۆیەکەی ئەمەیە کە«سکلێتی بێ مندالّیی (تانوو)»ی لە زگدایە. لەم جۆرە دەربرینە ماددی ومەلموسانەدایە کە ململانێیی دەروونی هزری ئوستوورەیی



دەردەکەوێ؛ چونکە خەیالّی ئوستوورەیی لەلایەك هەولّ دەدات کەجیهان «رۆحانی» بکات و لەگەلّیشیدا وەك «تۆ» مامڵە بکات، بەلاّم لەلایەکی دیکەوە هەموو سیفات وچالاکییەکان و تەنانەت هەموو دۆخ و پێوەندییەکان دەداتە پالّ بنچینەیەکی زبر و ماددی و بە جۆرێك خەریکی ماددی کردنی ناوەرۆکی «هزرەکان» و«مەعنەویات» ە. (و ئەمە بە وردی هەمان کارە کە مارکسیزمیش دەیکات. لەم رووەوەش سروشتی جادوویی ــ ئوستوورەیی مارکسیزم ئاشکرا دەبێت.)

ئەم قسەیە راستە کە هزری ئوستوورەیی هەولّ دەدات بە زیاد کردنی سەرەداوێك لە پێوەندییەکانی نێوان دۆخی کۆتایی، جۆرە بەستنەوەیەك لەنێوان هۆ و هۆکاردا بخولقێنێ، بەلاّم تەنانەت ئەم پێوەندییانەش خەسلەتێکی ماددیان هەیە. لە روانگەی هۆبەندیی زانستی ــ شیکارییەوە، ئەو پرۆسەیە بە بەردەوام پێناسە دەکرێ کە رەوشتەکەی لەگەلّ یاسایەکی تاکدا یەکانگیر بێت و بکرێ گشت پرۆسەکە بەشێوەیەکی مەنتقی بخرێتە چوارچێوەی ئەوەوە و رەوتەکەی لەساتێکەوە بۆ ساتێکی دیکە دەست نیشان بکرێ. واتە بکرێ لە هەرساتدا دۆخی تایبەتی رەوتەکە بەچەند رادەی بیرکاریی پیشان بدرێ.

هەموو ئەم رادە جۆراوجۆرانە هێلّێك پێکدنێن کە دەربڕی گۆڕانی پرۆسەکەیە وهەمووی ئەوانە سەربە یاسایەکی گشتین وبە ناچار لەم رێسایەوە دێن. لەم یاسایەوە، هەم «تاقانەیی»و هەم «جیاوازی»، هەم «پێکەولکان» وهەم « لەیەك دابڕان»یش وەك کارای جیاکەرەوەی پرۆسەکە دەنوێندرێنەوە. بەلاّم هزری ئوستوورەیی نە تاقانەیەتییەکی ئاوا کە لە پێکهاتنی قۆناغە

جۆراوجۆرەکانی پرۆسەکەوە هاتوون، دەناسێ و نە تاقانەیەتی قۆناغە جیاکراوە و جیاکانی. تەنانەت ئەو کاتەش کە واپێدەچێ کردارێك بەچەند قۆناغێکی جۆراوجۆردا دابەش دەکات، ئەم «کردارە» بەتەواوی بەشێوەی ماددی هەست پێکراو دەبینێ و لە پەیکەرەیەکی ئاوادا تاوتوێی دەکا. واتە هەرتایبەتی یان سیفەتێك لە کردار بەچۆنێتی مادەیەکی تایبەتەوە دەداتە پاڵ؛ مادەیەك کە لە شتێکەوە بۆشتێکی دیکە دەگوازرێتەوە. تەنانەت ئەوەی لە هزری زانستیدا بە سیفەتێکی رواڵەتی (عرچی ) یان زووتێپەڕ دادەنرێ لە هزری ئوستوورەییدا خەسلەتێکی بەتەواوی ماددی وەردەگرێت و بەمجۆرە دەگوازرێتەوە. دەڵێن سوورپێستانی هوپا (Hupa ) *ئێش* بەجەوهەرێکی ماددی دادەنێن. هەروەك پێشتر گوترا، هزری ئوستوورەیی سیفەتی مەعنەویش بە جەوهەری ماددی شیاوی گواستنەوە دەزانێ. *شینتۆیەکی* ژاپۆنی کە دەیهەوێ لە « باری » گوناهەکانی خۆی رزگاریی بێت، دەبێ بچێتە لای « کاهێن » و کوتە کاغەزێکی کە بە شێوەی جلك براوە، وەرگرێ ناونیشانی و ساڵ و مانگی لە دایکبوونی خۆی لە سەر بنووسێ. پاشان کاغەزەکەی لە لەشی دەساوێ و دوای ئەم کارە فووی لێدەکات، بەڵکوو بە مجۆرە هەمموو سوچ و گوناهەکانی بگوازرێنەوە بۆ کاغەزەکە. لە کۆتایی ئەم رێورەسمی « پاککردنەوە »یە دا، کاغەزەکە، کە جۆرێك «بزنی بەلاّ گەردانە» دەخاتە رووبار یان دەریاوە تا چوارخوای پاککەرەوە بەرەو جیهانی ژێرین رێنوێنی بکەن و لەوێدا بێ ئەوەی ئاسەوارێکی لەدوا بەجێ بمێنێ لەناوبچێ.



رێورەسمی تاج دانانی فیرعەونەکانی میسر بە بەرپاکردنی هێندێ بۆنەی ئایینی تایبەتی و داب و نەریتی تایبەت بەرێوە دەچوو تاکوو سیفاتی خواوەندیی لەرێگەی تاج و گۆچانی پاشایەتیی و قەمچی و شمشێرەوە بگات بەفیرعەون. ئەگەر ئەم ئامرازانە تەنیا وەك رەمز و هێما سەیر بکەین واتای راستینی رێورەسمی تاج دانانمان درك پێنەکردووە. ئەو ئامێرانە، تەلەسمی واقیعیی کەرەستەکانی گواستنەوەی هێزە خوداییەکان ودیدەڤانانی ئەو هێزانە بوون. لەنێوان هێندێ هۆزی باکووری ئەفریقیادا، دانیشتنی حاکمی نوێ لە سەرتەخت کاری سەرەکیی رێورەسم و بەزمی جێنیشینی یە. تەختی پاشایەتی بتێکە کە بەهێزێکی رەمزاوی پاشا ئاوس بووە. شازادەیەك کە لە سەری دادەنێشێ بە هۆی هێزی جادوویی تەختەکەوە پلەی پاشایەتی وەدەست دێنێ. بە لە بەرچاو گرتنی ئەو دوو نموونەیەی سەرەوە تێدەگەین کە ئەو چەمکەی ئوستوورە لە « هێز » مەبەستێتی لەگەڵ چەمکە زانستییەکەی جیاوازە. ئوستوورە هێز بە پێوەندییەکی داینامیکی یان دەربڕینی کۆمەڵە پێوەندییەکی هۆدار نازانێ، بەڵکوو بەردەوام بەجەوهەرێکی ماددی دادەنێ. ئەم جەوهەرە لەسەرانسەری جیهاندا دابەشکراوە، بەلاّم لە هێندێ کەسی تایبەتدا چڕبۆتەوە. جادوگەر یان شەڕکەری هۆز لەو کەسانەن کە ئەم هێزەیان تێدایە، هەبوونی ئەم جەوهەرە ماددییە لە جادووگەردا بە «مانا » (mana) ناودەبرێ. جادووگەر دەتوانێ بە دەست لێدان یان هەست پێکردنی کەسێکی دیکە تەواوی ئەم جەوهەرە ماددییە یان بەشێکی بگەیەنێ. لە هزری ئوستوورەییدا نەخۆشییش پرۆسەیەك نییە کە بە پێی بارودۆخی ناسراوی ئەزموونی و گشتی لە چوارچێوەدا کار بکات، بەڵکوو یان

ماددەیەکی بیانی هاتۆتە ناو لەشەوە یان روحێکی دزێوە کە جەستەی داگیرکردووە. ئەم رووحەش بوونێکی ماددی هەیە کە دەبێ بە بەرێوەبردنی چەند رێورەسمێکی تایبەت یان بەدۆعا خوێنی لە لەشیدا ڕاوی بنێ یان بۆ لەشێکی دیکەی راگوێزێ. دەقی پزیشکیی کۆن پێیانوایە تا لە مادەی «گەرم» ەوە بۆ لەشی مرۆڤ دێت؛ ئەوگەرمایەی دەبێتە مایەی تا و نەخۆشییەکە لەوانەیە لەبەر چاوەزار پەیدابێت یان لەبەر جادووی دوژمنەوە «ئیرادە »بکرێ. ***جەیمز فریزێر*** لە بەرهەمە پرشنگدارەکەی بەناوی لقی زێڕین (بەشی چوارەم، بزنی بەلاگێڕ، ص ۳۱ ) دا دەنووسێ:

زۆرجار زیندەوەران وەك ئامرازی گواستنەوەی شەڕ بەکاردێنن. لە ***گینە*** کاتێ کەسێك نەخۆش دەبێ و لەجێدا دەکەوێ مریشکێکی زیندووی لە ئەستۆ دەکەن و لە سەرسینگی دادەنێن. ئەگەر هاتوو مریشکەکە باڵەکانی پێکدادان یان قرتەقرتی کرد، نەخۆشەکە بەخێری دەزانێ وهیوادار دەبێت کە ئازارەکە لەوەوە گوزراوەتەوە بۆمریشکەکە و بەزوویی چاك دەبێتەوە؛ بەلاّم ئەگەر هاتوو مریشکەکە کاردانەوەیەکی لەخۆی نەنواند ئازارەکە بەردەوام دەبێت. هەروەها کاتێ کەیەکێ لەخەڵکی ***موریتانی*** تووشی سەرێشە دێت، مەڕ یان بزنێك دەگرێ وئەوەندی لێدەدات تا حەیوانەکە لەپێ بکەوێ. لەم کاتەدا پێیوایە کە سەرێشەکەی بەحەیوانەکە گەیشتووە.



**۳- فەزا (فضا):**

شهوودی ئوستوورەیی فەزا، لە نێوان تێگەیشتنی هەستیانەی فەزا ومەعریفەی زانستیی فەزا، واتە ئەندازەدا، هەڵکەوتووە. ئاشکرایە کە فەزای تێگەیشتنی هەستی، واتە ئەو فەزایەی کە هەستی بیستن وبینین دەیهێننە ئاراوە، لەگەڵ فەزای بیرکاری (ماتماتیکی)ی تۆخدا یەك نییە. لە راستیدا لەنێوان ئەم دوو فەزایەدا جیاوازییەکی بەرچاو لە ئارادایە. تایبەتییەکانی فەزای بیرکاری تەنیا لە فەزای هەستییەوە بەرهەم نایەت، بە پێچەوانەوە بۆ گەیشتن بە فەزای «مەنتیقی»ی بیرکاریی تۆخ، دەبێ هەموو ئەو شتانەی لەتێگەیشتینی هەستەوە بەرهەم دێن رەت بکرێنەوە. بەراوردی نێوان فەزای «فیزیۆلۆژی» و فەزای «مەتری»، کە ئەندازەی ئۆقلیدۆسی لە سەر رۆنراوە، ئەم جیاوازییە دەسەلمێنێ. فەزای ***ئوقلیدۆسی*** سێ تایبەتیی سەرەکی هەیە: ***پەیوەستی، بێ سنوری و هاوچەشنی***. بەلاّم ئەم تایبەتییانە لە بەرانبەرکێ لەگەڵ تێگەیشتنی هەستییانەی فەزادان. تێگەیشتنی هەستییانە لە چەمکی بێ سنوری تێناگا و لە هەمان سەرەتادا لە چوارچێوەیەکی فەزایی تایبەتدا کە هێزی تێگەیشتنی هەست بەسەریدا دەسەپێنێ، قەتیس دەبێ. لەپێوەندی لەگەڵ فەزای تێگەیشتنی هەستییانەوە نە لە بێ سنووریتی فەزا دەکرێ قسەبکرێ، نە لە هاوچەشنی و وەك یەکیی. بناغەی سەرەکیی هاوچەشنی و وەك یەکیی فەزای هەندەسی ئەمەیەکە توخمەکانی، واتە « خاڵەکان » (کە لە فەزادا پێکەوە پێوەندییان هەیە )، تەنیا دیاریکەری « دۆخ »ەکەن و هیچ ناوەرۆکێکی سەربەخۆ لەخۆیان یان لە دەرەوەی خۆیان لەم سیفەتەدا نییە.

واقیعییەتی «خاڵەکان» تەنیا لەو پێوەندییە دایە کە پێکەوە هەیانە. لەم رووەوە واقیعییەتی ئەوانە تەنیا ئەرکی (فونکسیونل)یە نەك ماددی. لەبەر ئەوەکە «خاڵەکان» بیَ ناوەرۆکن وتەنیا دەربڕی پێوەندیی و سیفەتی تۆخن، لەبارەی جیاوازییان لەرووی ناوەرۆکەوە هیچ جۆرە پرسیارێك نایەتە ئاراوە؛ و هاوچەشنی ئەوانەش شتێك نییە جیا لە یەکسانییان لە رۆناندا، کە لە بەکارهێنانی مەنتیقی و واتای ئایدیالی هاوبەشیاندا هەیە. لەم رووەوە فەزای هاوچەشنی ئەندازە هیچ کات نابێتە فەزای ئاراستەکراوی تێگەیشتنی هەستی، بەڵکوو ئەم فەزایە، بە« شێوە »یەکی چەمکییانە دروست دەبێت. لەواقیعدا چەمکی ئەندازەییانەی هاوچەشنی دەکریَ بەم بنەما بابەتییە دەربڕدریَ کە لە هەر خاڵێکی فەزادا بکریَ چەند شێوەیەکی وێکچوو لەئەندازە و روو (جیهەت)ی دڵخوازدا رەسم بکرێت. لەفەزای تێگەیشتنی هەستیدا راستەوخۆ ناکریَ لەهیچ جێیەکدا ئەم بنەما بابەتییە وەڕاست گەڕیَ، چونکە هیچ جۆرە هاوچەشنی و وەك یەکییەك لە رووی بار و ئاڕاستەوە لە ئارادا نییە. هەر شوێنێك دۆخی تایبەتی خۆی و نرخی تایبەتی خۆی هەیە. فەزای بیستن وفەزای بینین هەر دووك لە بەراورد لەگەڵ فەزای مەتری هەندەسەی ئوقلیدۆسیدا ناهاوچەشن و جیاوازن. ***ئێرنێست ماخ***، فیزیازان و فەیلەسووفی ناوداری ئوتریشی لە بەرهەمەکەی بەناوی ***مەعریفە و هەڵە***دا دەنووسیَ: «لە فەزای بیستن و فەزای بینیندا رووی سەرەکی ئەندامەکانی ئێمە وەك ***پێش، دوا، سەریَ، خواریَ، چەپ*** و***راست*** وەك یەك نین».

ئەگەر ئەم بەراوردکردنە بەپێوەر دابنێین، لەم بارەیەوە کە فەزای ئوستوورەیی وفەزای تێگەیشتنی هەستی لە پێوەندییەکی نزیك دان و



بەتەواوی لە بەرانبەری فەزای هەندەسیدان، تووشی گومان دێین. بەلاّم هەم فەزای ئوستوورەیی وهەمیش فەزای تێگەیشتنی هەستی بەتەواوی ئافرێنراوی هەست پێکراوی ئاگایین کە لەوانەشدا جیاوازیی نێوان «دۆخ » (وضعیت) و« ناوەرۆك» (محتوا) کە بنەمای فەزای هەندەسییە، شتێکی نەناسراوە. لە فەزای ئوستوورەیی وفەزای تێگەیشتنی هەستی دا، «دۆخەکە» شتێك نییەکە لە ناوەرۆك جیابێت یان وەك تاکە توخمێك لەگەڵ مەدلوولی سەربەخۆدا، لە بەرانبەر ناوەرۆکدا بێت. تەنیا شتێکی دەکریَ بگوتریَ «هەیە» ئەوەیە کە ناوەرۆکێکی دیار یا ناوەرۆکێکی تاقانە یان شهوودی هەبێت. لەم رووەوە لە فەزای هەستیدا، وەك فەزای ئوستوورەیی، هیچ «ئێرە» و «ئەویَ»یەك ئێرە وئەوێی تۆخ یان دەستەواژەیەکی تۆخ نییە کە بتوانیَ لە پێوەندییەکی گشتیدا، بیَ سەرنجدان بەناوەرۆکەکەی، دابنریَ؛ چونکە هەرخاڵێك یان هەر توخمێك، جۆرێك چۆنێتی (کیفیت)ی تایبەت بەخۆی هەیە. ئەم چۆنێتییە تایبەتە ناکریَ لەچوارچێوەی چەمکی گشتیدا وەسف بکریَ، بەڵکوو دەکریَ راستەوخۆ ئەزموون بکریَ. ئەم چۆنێتییە تایبەتە بەدوو ئاڕاستەی فەزاییانە و(دۆخ)ی فەزاییانەوە بەستراون. دیتمان کە فەزای فیزیۆلۆژیی لە فەزای مەتری جیاوازە، چونکە چەپ و راست، پێش و پاش، سەریَ وخواریَ تێیدا لە یەکتر جیاوازن وناتوانن لەجێی یەکتردا بێن. ئەم جیاوازییە لەوەوە دێت کە جولاّن لە هەرکام لەم روانەدا پێویستی بەهەستی ئۆرگانیکی تایبەت هەیە وهەرکام لەم روانە نرخی سۆزەکی ئوستوورەیی تایبەتی هەیە. لە بەرانبەر هاوچەشنێتی فەزای چەمکییانەی هەندەسەدا، لە فەزای ئوستوورەییدا، دۆخ وجیهەت، سیمای تایبەتیان هەیە.

ئەم سیمایانە بەردەوام وەك سیمای سەرەکی ئوستوورەیی، واتە دابەشکردنی جیهان وکاروبارەکەی بۆ پیرۆز و ناپیرۆزدەگەرێتەوە. ئەو بەربەستانەی ئاگایی ئوستوورەیی دایان دەمەزرێنێ و لەرێگەیانەوە چوارچێوەی فەزایی و ژیرەکی خۆی دادەرێژێ، لەسەر بەربەستیی منی مرۆڤـــ، وەك نەفسی ئیرادەکەر وکارا دامەزراوە. من، لە رووبەرووبوونەوە لەگەڵ واقیعییەتی جیهانی دەرەوەدا، کۆسپی تایبەت بەخۆی بەدی دێنێ کە لەگەڵ هەست وئیرادەیدا لە پێوەندی دان. جیاوازیی سەرەکی نێوان شوێن یان ئاراستە جۆراوجۆرەکانی فەزا بۆئەم جیاوازییەی نێوان دوو هەرێمی بوون (گیتی) دەگەرێتەوە. یەکیان هەرێمی گشتی ولەبەردەستدایە وئەوی دیکە هەرێمێکی پیرۆز وسنووردارە کە لە ژینگەی دەوروبەری خۆی جیابۆتەوە وسنورێکیان بەدەوردا کێشاوە تاکوو لە بەرامبەر ژینگەی دەوروبەری ناپیرۆزدا بیپارێزێ. وێنە و شێوە ئوستوورەییەکان بەردەوام ئەم جیاوازییە سەرەکییە دەنوێننەوە. بەجۆرە، هزری ئوستوورەیی دەزگای سیما فەزاییە تایبەتەکانی خۆی دادەمەزرێنێ. بەلاّم ئەم دەزگای سیماجیاکەرەوانە نەك بۆ ئەندازەگرتنی بابەتیانە بەڵکوو بۆ نیشاندانی بەها سۆزەکیی وزەینییەکان بەکاردێت.

گشتێتی جیهانی زانستی، گشتێتی یاساکانە. گشتێتی رێژە و چەندی (ماتماتیك)یە. فەزا وکات، ئەگەرچی سەرەتا وەك جەوهەر، واتە وەك شتێکی کە بۆخۆیان لەخۆیاندا هەن لە بەرچاو دەگیران (فیزیای نیۆتۆنی باوەڕی بەفەزا و بەزەمەنی رەها هەیە)، بەلاّم شان بە شانی گۆڕانی هزری زانستی، فەزا و زەمەنیش وەك سیستمێك لە رێژەکان پێناسەکران. لەمەودوا بوونی بابەتییانەی فەزا و زەمەن تەنیا بەم واتایەیە کە فەزا و زەمەن شهوودە



ئەزموونییەکان مسۆگەر دەکەن وچەند بنەمایەکن بۆ درك پێکردنی تەجرەبە. لە فەزای مەعریفەی تۆخدا، واتە لە هەندەسەدا، پێوەندیی گشتی فەزایی بە پاژی فەزاییەوە ماددی نییە، بەڵکوو تەنیا ئەرکییە. گشت فەزا لە پێکەوە لکانی توخمەکانییەوە رۆنانرێ، بەڵکوو توخمەکانی فەزا، «بار و دۆخ»ی رۆنانی فەزان. هێڵ لە «تەکوینی» خاڵ، لاپەڕە لە «تەکوینی» هێڵ، جەستە، لە «تەکوینی» لاپەڕە بەدەست دێت. هزر، بەپێی یاسایەکی تایبەت هەریەکێکیان لە گەشەپێدانی ئەوی دیکەیان دەخولقێنێ. شێوە (شکل) ئالۆزە فەزاییەکانیش لە رێگەی پێناسە کردنی تەکوینییانەوە درك پێدەکەین. ئەم پێناسەکردنە تەکوینییە شێوە و رێسای بەرهەمهێنانیان دەردەبڕێ. کەواتە تێگەیشتنی گشتێکی فەزاییانە، پێویستی بە توخمە پێکهێنەرەکانێتی، واتە «خاڵەکان» و رەوتەکەیان.

فەزای ئوستوورەیی، لە بەرانبەر فەزای فۆنکسیۆنێلی بیرکاریی تۆخدا، دارێژراوانەیە. گشت لە فەزای ئوستوورەییدا بەپێی گەشەی تەکوینی توخمەکانی و بە پێی رێسایەکی دیار ناخولقێ؛ بەڵکوو لەنێوان گشت و پاژەکانیدا پێوەندییەکی خۆڕسکانەی وەستاو لە ئارادا هەیە. هەرچەندی گشتەکە دابەش بکەین، لە یەکە یەکەی پاژە بەدەست هاتووەکانی، فۆڕم یان پێکهاتەی گشتەکە دەبینین. لە شیکاریی فەزای هەندەسیدا، گشت بە توخمی هاوچەشن و لەئاکامدا بێ شکڵی وەك هێڵ وخاڵ، کەرت دەکرێ. بەلاّم لەفەزای ئوستوورەییدا، بە دابەشکردنی پەیتاپەیتا، پێکهاتە لەناو ناچێ؛ و پێدەچێ کە گشت جیهانی فەزا و وێرای ئەویش جیهان، بەپێی نموونەیەکی دەست نیشان کراو دروست کرابن، نموونەیەك کە دەتوانێ خۆی لە هەموو

ئەندازەکان چ گەورە وچ بچووك پیشان بدات. بەڵام پێکهاتە لەهەردوو ئاستەکەدا یەکە. هەموو پێوەندییەکانی فەزای ئوستوورەیی لەئاکامدا بە سەرچەشنێك (ئەرکی تیپ)ی سەرەتاییەوە بەندن. هەموو ئەو پێوەندیی (یان ڕێژەیانە) بۆ یاسایەکی دینامیکی ناگەڕێنەوە بەڵکوو بۆ یەکبوونی سەرەتایەتی جەوهەر دەگەڕێنەوە. بەهێنانەوەی نموونەیەك خەسلەتی فەزای ئوستوورەیی دەکرێ باشترنیشان بدرێ:

میسرییە کۆنەکان لەسەر ئەوباوەڕە بوون کە خولقێنەری (هەتاوــ خوا ) لە ئاوە پڕشەپۆلەکانەوە سەری هەڵبڕیوە و بەخۆڵی ویشك تەپۆڵکێکی بچووکی دروست کرد تاکوو بتوانێ لەسەری رابوەستێ. ئەم تەپۆڵکە سەرەتاییە، کە ئافراندن لەوێوە دەستی پێکرد بوو، بە پەرستگەی خۆریان لە *هلیوپولیس* دەزانی. بەڵام (قدس الاقداس )ی هەر پەرەستگەیەك بەهەمان قودسییەتی پەرەستگەی خۆر بوو؛ وهەر خوایەکیش، لەمەقامی خواوەندیی خۆیدا، سەرچاوەی هێزی ئافرێنەر بوو، کە لەم رووەوە لە سەرانسەری وڵاتی میسردا (قدس الاقداس )ی هەر پەرەستگەیەکیان لەگەڵ تەپۆڵکەی یەکەمیندا ( = نموونەی ئەزەلی = ئارکیتیپ)یان وەك یەك دادەنا. بەپێی ئەم باوەڕە لەبارەی پەرەستگەی *فیلئادا*، کە لە سەدەی چوارەمی پێش زایندا دروست کرا بوو، گوتراوە: « ئەم پەرەستگەیە کاتێك ئافرێنرا کە هیچ شتێك لە ئارادا نەبوو و شتێکیش نە ئافرێنرابوو و زەوی هێشتا لەتاریکی وتنۆکیدا بوو». بۆ پەرەستگەکانی دیکەش ئەم بانگەشەیان دەکرد. لەناوی زیارەتگە مەزنەکان لە (*ممفیس* )، (*تبس*) و (*هرمون تیس* )ەوە بەئاشکرایی دەردەکەوێ کە ئەوانە « یەکەمین دوڕگەی ئیلاهی » ن. لە کۆندا میسریەکان کاتێ کە



پەرەستگەیەکیان دروست دەکرد، پێیان وابوو کە پیرۆزیی دەروونی شوێنی پەرەستگەیەکە لەخۆوە دەردەکەوێ. لەم رووەوە هەر زیارەتگایەك سیفاتی خۆرسکانەی تەپۆڵکی یەکەمی بوو. هاونرخی و یەکسانی هەر پەرەستگەیەك لەگەڵ تەپۆڵکی یەکەمیندا لە میعماریشدا رەنگی دەداوە. دەرکەی ( قدس الاقداس ) لە هەر پەرەستگەیەکدا بە چەند پلیکانێك لە سەکۆکە (صحن)بەرزتربوو، بە جۆرێکیش دانرابوو کە بەرزییەکەی بەتەواوی دیار بوو. گۆڕستانە سەلتەنەتییەکانیش لەگەڵ تەپۆڵکی یەکەمدا لەیەك جەوهەر بوون. میسرییەکۆنەکان لە سەر ئەو باوەڕە بوون کە پاشا مردووەکان دووبارە زیندوو دەبنەوە، لەم رووەوە بۆ زیندووبونەوەی پاشاکان هیچ شوێنێك پیرۆزتر وهیچ ناوچەیەك پیرۆزتر لە تەپۆڵکی یەکەمین (واتە ناوەندی هێزە ئافرێنەرەکان کە رێکخستنی ژینی جیهان لەوێوە دەستی پێکرابوو ) لە ئارادا نەبوو. بەپێی ئەم جۆرە بیرۆکەیە گۆڕستانی سەلتەنەتیشیان وەك قوچەك (هرم) دروست دەکرد تاکوو لە تەپۆڵکی یەکەمین بچێت.

لە فەزای هاوچەشن وپەیوەستەی بیرکاریی تۆخدا، پێگەی هەر شوێنێك بەبێ لێڵی دەست نیشان دەکرێت. لە روانگەی زانستییەوە تەنیا یەك شوێن لە ئارادابووە کە لەوێ زەویی ویشك (یا تەپۆڵکی یەکەمین ) لە ئاوی پڕ شەپۆلاندا سەری هەڵبڕیوە. بەڵام میسرییە کۆنەکان وەها رەخنەیەکیان بە چەواشەکاری و سەفسەتەی زمانی دادەنا. چونکە لەروانگەی ئەوانەوە هەموو پەرەستگە و وگۆڕستانە سەلتەنەتییەکان هەمان پیرۆزێتی تەپۆڵکی یەکەمینیان هەیە. و لەبەرئەوەیکە سیمای میعمارییەکانیان وەك تەپۆڵکی یەکەمین ( = نموونە ی ئەزەلی = ئارکە تیپ ) بوو، لەگەڵ تەپۆڵکی

یەکەمیندا لەیەك جەوهەربوون. (لەدوو وتاری پێشوودا گوترا کە هزری ئوستوورەیی لەدرك پێکردنی فۆرمی تۆخدا [= ئایدیال]داماوە، هەربۆیە پێی وایە دووشتی وەك یەك، یەك جەوهەری مادییان هەیە. ) لە روانگەی میسرییە کۆنەکانەوە ئەم پرسیارە پووچ بوو کە کام یەك لەم بینایانە شیاوترە تاکوو بە تەپۆڵکی یەکەم ناوببرێ ؟ ئاوە پرشەپۆلە سەرەتاییەکان، کە ژین لە وانەوە سەری هەڵدابوو، لە زۆر جێیان هەبوو و لە ئابووریی میسریشدا دەوری کاریگەریی خۆی دەبینی. بەباوەڕی میسرییە کۆنەکان ئاوە خرۆشاوە سەرەتاییەکان بەشێوەی ئەقیانووس دەوران دەوری زەوییان داگرتووە. زەوی لە دڵی ئەو ئاوانەوە هاتووە و ئێستا بەرووی ئەوانەوە لە مەلە دایە. لە بەر ئەمەش ئاوەکانی ژێر زەویش هەر ئەم ئاوە شەپۆلاوییانەن. بە پێی ئەم بیرۆکەیە تابووتی پاشاکانیان لە شوێنێك دادەنا کە بە شێوەی جزیرە بوو و لە هەر دوو لاوە پلیکانی هەبوو، تەرمی پاشایان بەمجۆرە بەخاك دەسپارد و پێیان وابوو کە ئاوی رووباری نیل، کە دەبووە مایەی بوژانەوەی بەرهەمهێنی کێڵگەکان، دەبێ هەمان ئاوە شەپۆلاوییە سەرەتاییەکان بن.

**٤- زەمەن:**

هەرچەند فۆڕمی فەزا بۆ پێکهاتەی جیهانی بابەتییانەی ئوستوورەیی زۆر گرنگە؛ سەرەڕای ئەمەش ئەگەر لە مەقوولەی فەزادا بوەستین هەرگیز ناتوانین بچینە ناو بوونی واقیعی یان «جەرگەی »جیهانی ئوستوورەییەوە.

ئەو زاراوەیەی کە زمان لەرێگەیەوە، جیهانی ئوستوورەیی پێناسە دەکات، دەربڕی ئەم خاڵەیە. چونکە واتای سەرەکی « میتوس»



(=ئوستوورە)، نەك روانینێکی فەزاییانە، بەڵکوو روانینێکی زەمەنی تێدایە. میتوس بەشێوەیەکی بەرچاو« سیما » (وجە)ی پێوەندیدار بە زەمەنەوە دەخاتەروو کە تێیدا، جیهان وەك گشتێك دەبینرێ. ئوستوورەی راستەقینە بەشهوودی جیهان و پاژ و هێزەکانییەوە، کە لە شێوەی هێندێ وێنەی دیاردا، واتە بەشێوەی خواکان و دێوەکانی لێ هاتبێ، دەست پێناکات؛ بەڵکوو بە «پەیدابوون » و تەکوینی ئەم وێنانە و بە « بوون » یان بە ژیانیان لە نێو زەمەندا دەست پێدەکات. کاتێ ئیدی بۆچوونێکی چەقیو لە بارەی خواکانەوە دڵخۆشکەر نەبێت، هێندێ رەوایەت دەگێڕدرێتەوە کە تێیاندا خواکان، بوون و سروشتی خۆیان لە زەمەندا دەردەخەن. کاتێ ئاگایی مرۆڤ هەنگاوێك بەرەوپێش هەڵگرێ و لە وێنەی خواکانەوە بە مێژووەکەیان (رەوایەتی خواکان) ەوە خەریك بێت، تەنیا لەو کاتەدایە کە لەگەڵ « ئوستوورەکان » بە واتا تایبەت و وردەکەی بەرەورووین. ئەگەرچەمکی « مێژووی خواکان» بە سیماجیاکەرەوەکانی کەرت بکەین، جەختمان لەسەر خوداکان نەکردووەتەوە. بەڵکوو جەختمان لەسەر مێژوو، واتە شهوودی زەمەنی کردۆتەوە. چوونکە « زەمەن » یەکێکە لە بارو دوخەکانی گۆڕانی چەمکی خواکان. هەر خودایەك تەنیا بە پاڵپشتی مێژووی خۆی لە سەرتەختی خواوەندی رۆدەنیشێ. هەر خوایەك تەنیا لەرێگەی مێژووی خۆیەوەیە کە لە هێزە بێ ئەژمار و ناتاکییەکانی سروشت جیابووەتەوە و وەك بوونێکی سەربەخۆ لە بەرانبەریاندا رادەوستێ وبەسەریاندا زاڵ دەبێت. تەنیا کاتێ کە جیهانی ئوستوورەیی بکەوێتە گەڕ، واتە کاتێ کە تەنیا جیهانی بوونەوەرە بێ جووڵەکان نەبێت بەڵکوو ببێتە جیهانی کردە، دەکرێ کەسایەتی سەربەخۆی هەرکام لە خواکان

و دێوەکان دەست نیشان بکرێ. لێرەدا خەسلەتی تایبەتی گۆڕان و کردار، کاریگەریی و کەوتنە ژێر کاریگەرییە کە بە بناغەی پێناسە کردنی ***خوا*** و ***دێو*** دادەنرێ. راستەکە دابەشکردنی جیهان بە پیرۆز و دزێو بناخەی ئاگایی ئوستوورەییە، بەلاّم جیهانی ئوستوورەیی کاتێ دەگا بە دەربڕینی راستەقینەی خۆی کە بەقوولاّیی رەهەندی زەمەندا رۆچووبێ، سروشتی بوونەوەری ئوستوورەیی، سەرەتا کاتێ دەردەکەوێ کە وەك بوونەوەری سەرەتا و سەرچاوە خۆپیشان بدات. هەموو پیرۆزێتی بوونەوەری ئوستوورەیی سەرەنجام دەگەرێتەوە بۆ پیرۆزێتی سەرچاوەکەی. پیرۆزێتییەکەی راستەوخۆ لە کارە پێشکەش کراوەکەدا نییە، بەلّکوو لە شوێنی سەر هەلّدانەکەوەیەتی. لەچونێتی و سیفاتەکەیدا نییە، بەلّکوو لە تەکوینی لەرابردوودایە. بەدانانی بوونەوەری ئوستوورەیی لە رابردوو و لە قوولاّیی زەمەندا، نەتەنیا ناوەرۆکێکی تایبەتی پیرۆز، کە شتێکی لە بواری ئوستوورەییەوە گرنگە، پێ دەردرێ، بەلّکوو لەم رێگەیەوە پیرۆزێتی و پلە و پایەکەی پاکانای بۆ دەکرێ. «زەمەن » هۆی سەرەکی پاکانە کردنە بۆکاروباری مەعنەوی، بەتایبەت عادەتەکان، رێورەسمەکان و رێسا وپێوەندییە کۆمەلاّیەتییەکان لەم رێگەیەوە پێروز دەکرێن و پاساو دەدرێن کە ئەوانە لەو دامەزراوانەوە هاتوون کە لە رابردووی سەرەتایی ئوستورییدا زالّبوون. لەروانگەی هەست وهزری ئوستوورەییەوە خودی بوون و «سروشت» ی شتەکان تەنیا کاتێ بۆ تێگەیشتن دەبن کە لە تێڕوانینێکی ئەوتۆدا دابنرێن.

کاتێك کە تایبەتییەکی بەرچاوی سروشت (یان خەسلەتێکی گرنگی شتێك یان سیفەتی بەرجەستەی چەشنێك لە زیندەوەران ) «دیاریی »دەکرێ،



کە پێوەند بێت بە رووداوێکی بێ هاوتاوە لە سروشتدا. ئەم رووداوە بێ هاوتایە تەکوینی ئوستوورەیی ئەوپیشان دەدات. چیرۆکە ئوستوورییەکانی هەموو گەلان لەم جۆرە « دەربڕینانە » پڕن. لێرەدا هزری مرۆڤـ گەیشتوەتە رادەیەك دەبێ هۆی هەبوونی رێورەسمەکان، نەریت وفرمانەکان بزانێ. بەم مەبەستە بوونی ئەوان دەگوازێتەوە بۆ رابردوویەکی ئوستوورەیی.

لە روانگەی ئوستوورەوە، رابردوو ئیتر « بۆچی »بۆ نییە. رابردوو خۆی «بۆچی/لەبەرچی » هەبوونی شتەکانە. ئەوەی زەمەنی ئوستوورەیی لە زەمەنی مێژوویی جیادەکاتەوە ئەمەیە کە بۆ زەمەنی ئوستوورەیی، رابردوویەکی رەها لە ئارادایە کە نە پێویستی بە دەربڕینە و نەشیاوی دەربڕین. مێژوو، هەبوونی دیاردەیەك بە زنجیرەیەکی بێ کۆتایی لە «بوون»کەرت دەکات کەتێیدا هیچ خالّێك وەك سەرەتا جیا ناکرێتەوە بەلّکوو خالّی پێش خۆی پیشان دەدات؛ و ئەم زنجیرەیە تابێ کۆتایی لە رابردوودا بۆ دواوە دەگەڕێتەوە. ئاشکرایە کە ئوستوورەش لە نێوان « هەبوون » (لە ئێستادا ) و«بوون» لە (رابردوودا)و لە نێوان « ئێستا »و« رابردوو»دا هێلّك دەکێشێ.بەلاّم کاتێ ئەم « رابردووە» بەدەست هات، ئوستوورە ئەوە وەك شتێکی بەردەوام و« بێ پرس و بۆ» سەیردەکات. بۆئوستوورە، زەمەن وەك رێژەی تۆخ نییە کە تێیدا رابردوو، ئێستا وداهاتوو بەردەوام بگۆرێن و ببنە یەکتر. لە زەمەنی ئوستوورەییدا لەمپەرێکی پتەو، «ئێستا»ی ئەزموونی لە سەرەتا (مبدأ)ی ئوستوورەیی جیادەکاتەوە و«خەسلەتێکی» گواستنەوە هەلّنەگر بە هەرکامەیان دەبەخشێ. بەم جۆرە ئەم بابەتە شیاوی تێگەیشتن دەبێت کە بۆچی هێندێ جار ئاگایی ئوستوورەیی بە(لەگەلّ هەموو

ئەو گرنگییەی کە شهوودی زەمەنی لە پێکهاتنیدا هەیەتی )ئاگایی بێ زەمەن ناو دەبرێ. چونکە زەمەنی ئوستوورەیی بە بەراورد لەگەڵ زەمەنی بابەتیدا (چ زەمەنی فیزیکی وچ زەمەنی مێژوویی ) بەراستی بێ زەمەنە.

دابەشکردنی زەمەن بە قۆناغی جۆراوجۆر بەتەریب لەگەڵ دابەشکردنی فەزا بە ئاراستە و ناوچەی جۆراوجۆر بەدی دێت. زەمەنیش وەکو فەزا بەپیرۆز وناپیرۆز دابەش دەبێت. هەستی ئوستوورەیی «دۆخ» و «ئاراستەی»ی نێو فەزا نەك وەك ڕێژەی تۆخ، بەڵکوو وەك پێگەی بوونەوەرێکی تایبەت، واتە پێگەی خوا یا دێو، سەیر دەکات. ئەم بابەتە لە بارەی زەمەن و دابەشکردنەکانیشیدا ڕاستە.

شهوودی ئوستوورەیی زەمەن وەك شهوودی ئوستوورەیی فەزا بە تەواوی چۆنییانە و هەست پێکراوە نەك چەندییانە وئنتیزاعی. بۆ ئوستوورە، زەمەنی «چەندییانە وئینتزاعی»، و زەمەنێك کە مۆسیقایەکی ڕێکی هەبێت و ساتەکان پەیتاپەیتا بەدوای یەکتردابێن وبەپێی ڕێسای دیاریکراو چەندپات ببنەوە، لەئارادا نییە. تەنیا شتێکی ئوستوورە دەیناسێ وێنەکانن کە ناوەرۆکێکی تایبەتییان هەیە وئەوانە «گشتاڵت» (پێکهات)ێکی زەمەنیی دیار ئاشکرا دەکەن؛ وەك: هاتن وچوون، هاتنە ئارای قۆناغەکان و گۆڕانی دەورەیی. بەمجۆرە زەمەن ،وەك گشتێك، بەسەر سنووری دەست نیشان کراودا وەك هێڵی میزان لە نۆتی مۆسیقا دابەش دەبێت. بەلاّم «لێدانەکانی» ناژمێردرێن و ئەندازەش ناگیرێن، بەڵکوو تەنیا هەست پێدەکرێ.

ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئاگایی مرۆڤ، کاتێکی دوور ودرێژ بەر لەوەی بتوانێ یەکەمین چەمکەکانی پێوەندیدار بە تایبەتمەندییە سەرەکی و



بابەتییەکانی فەزا و زەمەن و ژمارە پێك بێنێ، دەبێ لەپێوەندی لەگەڵ دەورەی گەڕان ومۆسیقای ژیانی مرۆڤ هەستیارێتییەکی ناسك بەدەست بێنێ. تەنانەت لە نزمترین قۆناغەکانی کولتور، و لەنێوان هۆزە سەرەتاییەکانیشدا کە هێشتا نەگەیشتوونەتە قۆناغی ژماردنی ژمارەکان ولەم ڕووەوە ناتوانن بەروونی لە پێوەندییە چەندییەکانی زەمەن بگەن، زۆرجار ئەم هەستە زەینییە بەرانبەر بە دینامیکی حەیاتیی پرۆسەی زەمەن بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر هەڵێداوە و زۆر ناسك و ورد بۆتەوە. ئەم هۆزانە، ئەو شتەی کە بە « هەستی قۆناغە » ئوستوورەییەکان ناوبراوە، هەیانە و لە هەموو ڕووداوەکانی ژیاندا، بە تایبەت لەکاتی تێپەڕین لە قۆناغێکی تەمەندا بۆ قۆناغێکی دیکەی تەمەن یان لەکاتی گواستنەوە لە مەقام وپلەیەکی کۆمەلاّیەتییەوە بۆ مەقام و پلەیەکی کۆمەلاّیەتی دیکە، بەکاری دێنن. تەنانەت لە نزمترین ئاستەکانیشدا، گرنگترین گۆڕان لە ژیانی تاك یان قەومدا ئاوێتەی هێندێ ڕێورەسم وبەرنامەی تایبەت دەبێت تاکوو لە ڕەوتی یەکپارچەی ڕووداوەکان جیاببنەوە. بەرێوە بردنی وردی ڕێورەسم و بۆنەکان، ڕەوتی گۆڕان لە سەرەتاوە تا کۆتایی دەپارێزێ. لەرێگەی ئەم بۆنانەوە، ڕەوتی یەکپارچە یا ڕەوتی یەکپارچەی زەمەن بەچەند قۆناغێك دابەش دەبێت. هەر قۆناغێك لە ژیان ،خەسلەتێکی ئوستوورەیی تایبەت بەدەست دێنێ کە واتایەکی تایبەتی پێ دەبەخشێ. لە دایکبوون ومەرگ، ئاوس بوون و لەدایك بوون، خۆناسین وشوکردن، هەمووڵەگەڵ ڕێورەسم و بۆنەی تایبەتی تێپەڕین و ڕێورەسمی شەرەفمەند بووندا دەردەکەون، ئەم ڕێورەسم وبۆنانە سیمایەکی ئوستوورەیی ئەوتۆ بە قۆناغەکانی ژیان دەبەخشن کە گوایە دەیانهەوێت پەیوەستەبوونی

ژیان لەناو بەرن. ئەم باوەڕە لە نێوان گەلانی جۆراوجۆردا باوە  و لە شێوەی جۆراوجۆردا دووپات دەبێتەوە، کە مرۆڤـ لەکاتی تێپەڕین لە قۆناغێکی ژیان بۆ قۆناخێکی دیکە، منێکی نوێ بەدەست دێنێ. بۆ نموونە منداڵ بەگەیشتن بەقۆناغی خۆناسین دەمرێ، منداڵ دەمرێ تاسەرلە نوێ وەك گەنجێکی خۆناسیو لەدایك بێتەوە. بەشێوەیەکی گشتی « قۆناغێکی قەیرانی » کە ماوەکەی کورت یان درێژە، دووقۆناغی گرنگی ژیان لەیەکتر جیادەکاتەوە. بۆ ئەوکەسەی کە لەم قۆناغە قەیرانییە دایە، بەرێوە بردنی هێندێ لەکارەکان واجب وهێندێکیان حەرامن.

بەمجۆرە دەبینین کە بۆ ئاگایی و هەستی ئوستوورەیی، شهوودی چەشنییانەی زەمەنی زیندەورناسی یان بەنۆرەهەستان و داکەوتنی ژیان بە واتایەکی تایبەت، لە پێش شهوودی زەمەنی جیهانیدایە ،. لە راستیدا ئوستوورە، زەمەنی جیهانی بەو شێوە زیندەوەرناسییە تایبەتە تێدەگا. چونکە لەروانگەی ئاگایی ئوستوورەییەوە نەزمی رەوتە سروشتییەکان وەك خولی سووڕانی وەرز و هەسارەکان بەتەواوی وەك رەوتی ژیان دەردەکەون. ئاگایی ئوستوورەیی سەرەتا گۆڕانی رۆژ بەشەو، رووان و وشك بوونی گژوگیا و گۆڕانی  وەرزەکان تەنیا لەگەڵ هەڵداشتنی ئەم دیاردانە بۆ ناو جەرگەی بوونی مرۆڤـ درك پێدەکات. واتە دەڵێی، ئەوانە، لەئاوێنەی بوونی مرۆڤـدا دەبینێ.

ئەم پێوەندییە دوولایەنەیە هەستی ئوستوورەییانەی زەمەنی لێدەکەوێتەوە کە لە نێوان شێوەی زەینی ژیان و شهوودی بابەتییانەی سروشتدا پردێك هەڵدەبەستێ. تەنانەت لە قۆناغی سیحراویدا ئەم دوو فۆرمە



بەچری پێکەوە تەنراون. هەرئەم دیاردەیە روونی دەکاتەوە کە جادوو چۆن پرۆسە بابەتییەکان دیاری دەکات. لە روانگەی جادووەوە، یاسایەکی نەگۆڕ رەوتی رۆژ و سووڕانی وەرزەکان رێك ناخات بەڵکوو ئەوانە لە ژێر کاریگەریی هێزە شەیتانیی و سیحراوییەکاندان. شێوەی جۆراوجۆری جادوویی پێوانەیی (قیاسی) زۆری پێدەوێ تاکوو ئەو هێزانەی لە گەڕانی رۆژ و یان وەرزەکاندا دەستیان هەیە، بخاتە ژێر کاریگەرییەوە، یان ئەوانە بەهێزبکاو بۆ کار هانیان بدات. ئەو رێورەسمانەی کە تەنانەت ئەمرۆ لە کاتی داهاتنی ساڵی نوێدا (نەورۆز، جەژنی پاك) یا لەرێورەسمی (اعتدالین) « جەژنی مێهرەگان و چوارشەمە سووری )» یان رێورەسمێك کە لە شەوی یەلدا یان لە شەوی یەکەم رۆژی هاویندا بەرێوە دەچن، لەسەر ئەم روانگە جادووییە دامەزراون.

شەڕی بەدرۆ کە لە رێورەسمەکانی پێوەندیدار بە جەژنە جۆراوجۆرەکاندا دێنە ئاراوە لە سەر ئەم تێگەیشتنەیە کە هێزی گیانبەخشی هەتاو و هێزی روێنەری سروشت، دەبێ بە بەرێوە بردنی بۆنە و رێورەسمەکان یاریدە بدرێن و ئەوانە لە بەرانبەر هێزە دژەکاندا بەهیز بکرێن وبپاریزرێن. شیعرێك لە سەردەمی میسری کۆندا ماوەتەوە کە تێیدا دوژمنانی فرعەون دەکەونە بەرتووك ونفرین. دەبێ لە بیرمان بێت کە *راء* (هەتاو ــ خوا )، یەکەم حاکمی میسر بوو و تا ئەو جێیەی کە وێنەی *راء* دەبینرا تا ئەوجێیەش هەرێم وحوکمرانیی فیرعەون بوو.

ئەم شێعرە دەڵێ کە دوژمنانی فیرعەون لە دەستپێکی ساڵی نوێدا وەك ماری **ئاپۆفیس** وان: ماری ئاپۆفیس، تاریکە دوژمنێکە، کە هەتاو هەموو شەوێك، لە رەوتی خۆی لە جیهانی ژێرەوە دا (لە شوێنی ئاوابوونی رۆژ لە

رۆژئاوا تا شوێنی هەڵاتنی لە  رۆژهەڵات)، شکست دەدا. بەڵام بۆچی دوژمنانی فیرعەون دەبێ لە کاتی سەرەتای ساڵی نوێدا وەك ماری ئاپۆفیس بن؟ وەڵامەکە ئەمەیە کە خولقاندن وسەرەتای ساڵی نوێ وەك یەك وان. کەواتە هێزە ئافرێنەرەکان لە سەرەتای ساڵی نوێدا لە هەموو دەم چالاکتر وبەهێزترن. هەربۆیە لە رۆژی یەکەمی ساڵی نوێدا، میسرییەکان دوژمنانی فیرعەونیان بەلەعنەت دەکرد و ئەم لەعنەتە بەسیحر وجادوو بەهێز دەکرا.

لەبابلدا لە هەزارەی سێیەمەوە تا سەردەمی *هیلنی*، جەژن وریێورەسمی نوێ چەندین رۆژی دەخایاند. لەم ریێورەسمانەدا کاهینەکان «سێفری خلقەت» یان دەخوێندەوە و پاشان شەڕی مەردوخ (خواوەندی بەهێز )لەگەڵ  دێوەزمەی تیامات دەبرایە سەرشانۆ.

ئەم ریێورەسمانە رەمزیی نەبوون، بەڵکوو بابلییەکان پێیان وابوو کە لەو ساتەدا شەڕی راستەقینە لەنێوان مەردوخ وتیاماتدا دێتە ئاراوە. پاشای بابل نموونە و رەمزی مەردووخ بووە. لەم رووەوە ئەو، یان کەسێکی لەلایەن ئەوەوە، لە رۆڵی مەردوخدا دەردەکەوت و لەگەڵ دێوەزمەی تیامات بەشەڕ دەهات. بابلیەکان دەیانویست بە هۆی بۆنە وریێورەسمانە، یارمەتی مەردۆخ بدەن لە شەڕی دژی تیامات.

هەم لە میسرو هەم لە بابل ریێورەسمی تاج دانانی پاشا لە سەرەتای یەکێ لە وەرزەکاندا بەرپا دەبوو تاکوو سەرەتای پاشایاتی نوێ وەخێرگەڕێ. لەمیسر، سەردەمی تاج دانان یان لە سەرەتای هاویندا بوو (کاتێك کە رووباری نیل سەرەتای هەستانی بوو) یان لە سەرەتای پاییزدا (کاتێك کە رووباری نیل داکەوتبوو وکیڵگەکان بە لیتەی نیشتوو داپۆشرابوون و ئامادەی



تۆو چاندن بوون). لەبابلدا هەرپاشایەك دەسەڵاتەکەی لە رۆژی یەکەمی ساڵی نوێوە دەستی پێدەکرد و ریێورەسمی کرانەوەی هەر پەرستگەیەکی نوێش لەو رۆژەدا بەرێوە دەچوو.

«هەستی قۆناغ»، زەمەن تەنیا لە چوارچێوەی وێنەی ژیاندا درك پێدەکات. لە ئاکامدا هەرشتێك کە لەزەمەندا دەگەڕێ، هەرشتێك کە بەنۆرە دێت ودەڕوا، وەك ژیان سەیر دەکات.

بەمجۆرە دەبینین کە ئوستوورە بەرانبەر بەو باتییەیەی کە لە چەمکی (فیزیکی ــ بیرکاری) زەمەندا، واتە زەمەنی رەهای نیۆتۆنی هەیەتی هیچ تێگەیشتنێکی نییە. ئوستوورە ئەو زەمــەنە رەهــایەی کە «بێ سەرنجدان بە هەر شتێکی دەرەکی، لە خۆیدا و بۆخۆی، بەرێوەیە» ناناسێ و بەمجۆرەش ئاگاداری زەمەنی مێژوویی نییە. چونکە لە ئاگایی زەمەنی مێژووییدا چەند هۆیەکی بابەتییانەی جۆراوجۆر لە ئارادا هەن، زەمەنی مێژوویی بە پێی تەقویمی نەگۆڕ وجیاوازیی نێوان «زووتر» و «درەنگتر» و دیتنی  نەزمێکی دیار و دەست نیشان کراو لە زنجیرەی ساتەکانی زەمەندا دامەزراوە. ئوستوورە، نە لەوەها دابەشکردنێك لە قۆناغەکانی زەمەن ئاگادارە و نە لە رێکخستنی زەمەن لە دەزگایەکی رێك وپێکدا  کە هەر رووداوێکی تایبەت کە تەنیا هەڵکەوتنێك و بارێکی هەبێ. پێشتر دیتمان تایبەتی هزری ئوستوورەیی ئەمەیە کە لە هەر جێدا پێوەندییەك لەنێوان شت و کاروبارەکاندا دادەمەزرێ، دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەندامەکانی ئەم پێوەندییە بچن بە ناویەکدا ویەك جەوهەریان هەبێت. ئەو بارودۆخە لە هەرێم و ئاگایی ئوستوورەیی زەمەنیشدا زاڵە. قۆناغەکانی زەمەن، واتە رابردوو، ئیستا و

داهاتوو لەیەکتر جیاواز نین: زۆرجار ئاگایی ئوستوورەیی جیاوازیی نێوانیان لە ناو دەبات وسەرەنجام ئەوانە ئاوێتەی یەکتر دەکات. بەتایبەت جادوو ئەم بنەماگشتییەی خۆی کە پێی وایە پاژ لەگەڵ گشتدا یەکە لە فەزاوەوە بۆ زەمەن دەگشتێنێ، و راست بەو جۆرەی کە هەر پاژێکی فەزایی نەتەنیا جێگیری گشت دەبێت، بەڵکوو گشتەکە خۆیەتی. پێوەندیی جادووییش بە سەر هەموو جیاوازیی و دابەشکردنە زەمەنییەکاندا دەرباز دەبێ. (ئێستا)ی جادوویی، تەنیا ئێستای تۆخ نییە، واتە ئێستای سادە وجیاکەرەوە نییە، بەڵکوو رابردوو و داهاتووش دەگرێتەوە. لەم رووەوە باسکردنی غەیب، پاژی جیانەبووی ئاگایی ئوستوورەییە. لە باسی غەیبیدا بەیەکدا چوونی چۆنییانەی هەموو قۆناغەکانی زەمەن بە روونترین شێوە دیارە.

**٥- فەزا - زەمەن:**

ناکرێ لەبارەی فەزا وزەمەنەوە قسە بکرێ وناوی ***ئالبێرت ئەنیشتاین*** و ***هێرمان مینکوفسکی*** نەهێنرێتە ئاراوە. ئەم دوو زانایە تێگەیشتنی ئێمەیان بەرامبەربە فەزا و زەمەن گۆڕی. ئالبێرت ئەنیشتاین لە بەرهەمە بەناوبانگەی، ***واتای رێژەیەتی*** دا دەنووسێ: « تیۆری رێژەیی پێوەندیی نزیکی لەگەڵ تیۆری فەزا ـــ زەمەندا هەیە.». [٤]

لە تیۆری رێژەیەتی گشتی ئەنیشتایندا زەمەن هەمووتایبەتییەکانی خۆی لە دەست دەدا. سێ رەهەندی فەزا و رەهەندی زەمەن لێکدەدرێن و



پێکهـــاتێکی چـوار رەهـەنـدی دروست دەکـەن. هەرخاڵێك لە جیهاندا بەتایبەتمەندیی فەزا ـــ زەمەن **X1**، **X2**، **X3** ، **X4** دیاری دەکرێ. ئەم سیمایانە تەنیا بەهای ژمارەیان هەیە و لەبەر ئەمەش دەتوانن لە جێی یەکتردا بێن. سەرەنجام لە فیزیای تیۆریدا، فەزا وزەمەن دەبن بە ژمارەی تۆخ.

**٦- ژمارە:**

لە سیستمی مەعریفەی تێوریدا، ژمارە، ئەڵقەیەکی پێوەندیی گرنگە کە دەتوانێ ناوەرۆکی جۆراوجۆر و جیاواز بگرێتەوە وبیانخاتە چەمکێکی تاقانەوە و بیانگۆڕێ.

ژمارە بە گۆڕینی هەموو جۆراوجۆرییەکانی لەتاکێتی مەعریفەدا، دەبێتە مەبەستی سەرەکی مەعریفە و وەك دەربڕی «هەقیقەت »دەردەکەوێ.

ئەم خەسلەتە سەرەکییە کاتێك کە بە ژمارە بەخشرا، یەکەمین پێناسەی فەلسەفی ـــ زانستی بۆکرا.

لە هێندێ پارچە نووسراوەدا کە لەپاش ***فیلولائوس*** بیرکاریزانی یۆنانی (سەردەمی دیمۆکراتیوس ) ماونەتەوە هاتووە:

زاتی ژمارە، هۆی مەعریفەیە. لە هەرشتێکی مەتەڵ ئاسا ونەناسراودا، زاتی ژمارە رێبەر وفێرکارە. ئەگەر ژمارە و زاتەکەی نەبایە هیچ کام لەو شتانەی هەن، چ لە خۆیاندا و چ لە پێوەند لەگەڵ شتەکاندا ،دۆخێکی روون ودیاریان نەدەبوو. بەڵام ئەمە ژمارەیە کە هەموو ئەوشتانەی کە گیان لە رێگەی تێگەیشتنی هەستیانەوە، تێان دەگات، رێکیان دەخات و شیاوی ناسین وبەراورد کردنیان دەکات لەگەڵ یەکتردا. دەڵێی ژمارە، کاریگەرییە

هەستییەکان دەخاتە چوارچێوەوە و پێوەندییە جۆربەجۆرەکانی نێوانیان دەستە دەستە دەکات، چ تاك بن و چ جووت.

دەسەڵاتی مەنتیقیانەی وردی ژمارە لەم پەیوەستبوون و لەیەکتردابڕانەی ڕێژەکان، و نەگۆڕ کردنیاندا، مەیوە.

ژمارە، جیهانی بەرهەست یا «مادە»ی درك پێکردنی هەستی، هەرچی زیاتر لە ماهییەتە تایبەتەکەی بەتاڵ دەکاتەوە وفۆڕمێکی ژیرەکی وگشتی پێدەبەخشێ. بەجۆرە خەسلەتی کاریگەریی هەستی ناراستەوخۆ (وەك مەلمووس بوون، دیتنی بوون و بیستنی بوون ) تەنیا وەك «چۆنێتی ناسەرەکی» دەردەکەون کە سەرچاوەی راستەقینە وبنجی سەرەکی ئەوانە دەبێ لە رادەی تۆخدا بۆی بگەرێین یان بەواتایەکی دیکە تەنیا لە ڕێژە ژمارەییەکاندا پەیدا دەبێ. گۆڕانکاریی زانستی تیۆریی مودێرن، ئەم ئایدیالەی ناسینی، نەتەنیا بە داشکاندنی خەسلەتە تایبەتەکانی تێگەیشتنی هەستی، بەڵکوو سروشتی تایبەتی فۆڕمە تۆخەکانی شهوودیشی وەك ماهییەتی فەزا وزەمەن کردوە بە ژمارەی تۆخ؛ راست بەو جۆرەی کە لێرەدا ژمارە وەك ئامرازی مەنتیقی راستەقینە بۆ هاوچەشنکردنی ناوەرۆکی ئاگایی بەکار دێت، ژمارە خۆشی پتر لە پێشووی بەبوونێکی هاوچەشن و وەك یەك دەگۆڕێ.

ژمارەکان هیچ جۆرە جیاوازییەکیان لەگەڵ یەکتردا نییە، جیا لەو جیاوازییەی کە دۆخی هەرکام لەوانە لەسیستمی گشتی ژمارەکاندا هەیەتی. هیچ سروشت و بوونێکیان نییە، جیا لەوەی کە بە دانانیان لە سیستمی ژمارەکاندا بەرهەم دێت. بە واتایەکی دیکە، ژمارەکان هیچ هەبوونێکیان



نییە جیا لەوەی لە ڕێگەی ئەو ڕێژانەوە کە لە پێکهاتێکی ئایدیال (=صوری) دا بە دەستی دێنن. کەواتە، « پێناسەکردنی » ژمارەکان و ئافراندنیان لە ڕێگەی میتۆدی رۆنانی (پێکهاتەیی )یەوە دەگونجێ. تەنانەت ئەگەر ئەم ژمارانە لەگەڵ هیچ شت یا دیاردەیەکی شهوودیدا پێوەندییەکی راستەوخۆیان نەبێت، لەم سیستمەدا ڕێژەکان بەروونی دیاری دەکرێن، وەك دەربڕینی ژمارەی لێڵ کە لە سەردەمی ***دێدکیند***ەوە باوە. لەتیۆری ژمارەکانی دێدکیندا[٥]، ژمارەی لێڵ (اصمّ) وەکو «قاشی» سیستمی ژمارەکانی گویا(منطق) دەردەکەون. ڕێسایەکی مەنتیقییانەی دەست نیشانکراو، سیستمی ژمارەکان بە دوو دەستە دابەش دەکات. لە بنەڕەتدا هزری بیرکاری هەر ژمارەیەك تەنیا بەشێوەی «قاش کراو» درك پێدەکات. لەروانگەی بیرکارییەوە، ژمارەکان شتێکی جیا لە دەربڕینی ڕێژە چەمکییەکان نین. ئەم ڕێژەیانە تەنیا لە گشتێتی خۆیاندا، پێکهاتێکی تاقانە وپشت بەستوو بە ژمارە خۆی و بەگشتی هەرێمی ژمارەکان پێشان دەدەن.

بەڵام لەگەڵ ئەوەی کە لە هەرێمی هزری زانستی ومەعریفەی تۆخەوە بەرەو هەرێمەکانی دیکەی گۆڕانی فەرهەنگی هەنگاو بنێین، ژمارە خەسلەتێکی دیکەی دەبێت. لە روانگەی ئوستوورەوە ژمارە خەسلەتی گشتی وای نییە کە لە هەموو جۆرە ناوەرۆکێکدا بەکار بێت. لە روانگەی هزری زانستییەوە، ژمارە خەسلەتێکی چەمکی هەیە؛ بەڵام لە ئوستوورەدا، خەسلەتی ژمارە لە شتێکی تایبەتەوە دێت کە بژمێردرێت و لە شهوودی ئەم شتەدا خەسلەتی ژمارەکە سنووردار و بەربەست دەکرێت. بەپێی ئەم بۆچوونە، ئوستوورە ژمارە جۆراوجۆرەکان بەشێوەیەکی رەها بەیەکسان

دانانێ. چونکە جۆراوجۆریی شتی شیاوی ژماردن، واتە شهوودی تایبەتی ناوەرۆك و هەستی ئەو بارەتایبەتەی بە رادەی تایبەتەوە بەندە، دەبێتە مایەی ئەوەی ژمارەکان بوونێکی بەتەواوی جیاوازیان هەبێت و ئەم بوونە جیاوازە، قورساییەکی تایبەتیان پێ دەبەخشێ. ئەم قورسایی یان چۆنێتییە کاریگەرەی ژمارە، لە هەرێمی بیرۆکە ئوستوورەییەکاندا ئاشکراترە. لە ئوستوورەدا شتەکان تەنیا ئایدیال نین و بەس. لەروانگەی ئوستوورەوە وێکچوونی شتەکان لە رووی سیماوە تەنیا لەبەر رێژەیەکی کە لە نێوانیاندا لە ئارادا هەیە نییە، بەڵکوو پێوەندییەکی جەوهەری و واقیعییە کە ئەوانە پێکەوە دەلکێنێ؛ و ئەم خەسلەتە ئوستوورەییە بەتایبەتی لە پێوەندی لەگەڵ وێکچوونی ژمارەییانەوە راستە. لە هەرجێگایەکدا کە دوو ڕادەی وەك یەك لەڕووی ژمارەوە هەبن، واتە لە هەرجێگایەکدا لە نێوان پاژەکانی دوو شتدا پێوەندییەکی سەربەسەر لە ئارادا بێت، هزری بیرکاری تەنیا ئەم پێوەندییە، بە پێوەندییەکی ئایدیال دەزانێ؛ بەڵام ئوستوورە ئەم یەکسانییە ژمارەییانە بەجۆرە «دەردەبڕێ» کە دووشتەکە «سروشتێکی» ئوستوورەیی هاوبەشیان هەیە. ئەگەر شتەکان لە بواری ژمارەوە یەکسان بن، هەر ئەندازەیەکیش لە بواری هێندێ چۆنێتییەوە جیاواز بن، ئوستوورە ئەم یەکسانییە ژمارەییانەیە بۆ یەك جەوهەری بوونیان دەگەرێنێتەوە و لەسەر ئەو باوەڕەیە کە تەنیا جەوهەرێکە بە شێوەی جۆراوجۆر خۆی دەردەخات و خۆی لە پەردەی ئەوانەدا دەشارێتەوە. باوەڕ هەبوون بەهێزێکی سەربەخۆ و بوونێکی جەوهەری بۆ ژمارە، نموونەی بەرچاوی کەسایەتی بەخشینی ئوستوورەیە بە مەقوولەی چەندێتی. لە هزری مەنتیقیدا، ژمارە چەمکێکی گشتییە و ئەرکێکی گشتی



هەیە، بەڵام لە هزری ئوستوورەییدا ژمارە هەمیشە وەك بوونێکی رەسەن دەردەکەوێ کە جەوهەر و هێزی خۆی بە هەرشتێك دەگەیەنێ کە لە ژێر سەیتەرەیدا بێت، هەر ژمارەیەکی تایبەت بە بازنەیەکی سیحراویی دەورە دراوە و هەر شتێکی کە لەگەڵ ئەو ژمارە تایبەتەدا پەیوەست بێت، دەکێشرێتە ئەو بازنە جادوییەشەوە. لەراستیدا بەشی سەرەکی جادوو، جادووی ژمارەییانەیە.

لێرەدا مەعریفەی چوارچێوەی هزری ئوستوورەیی کۆتایی دێت. خوێندکارانی لقی فیزیا تێگەیشتوون کە بەچوار هاوکێشەی ***ماکسول*** دەکرێ هەموو مەسەلەکان لە ئەلەکترۆمۆگناتیسدا و بە فۆرمۆلی هێزی راکێشانی گشتی، سێ یاسای ***نیۆتۆن***، بنەمای مانەوەی ***مامنتۆمی گۆشەیی*** وبنەمای ***مانەوەی وزە***، *هەموو مەسەلە میکانیکییە کلاسیکەکان* چارەسەر بکرێن. (لە راستیدا باسەکانی دیکەی ناو کتێبی فیزیای کلاسیك تەنیا چەند تەکنیکێکن بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەکان.) چونکە ژمارەی یاساکانی سروشت کەمن.

لەم وتارەشدا هەموو فۆرمۆلەکانی هزری ئوستوورەیی ئارستە کراوە. بەڵام خوێنەری ئەم وتارە نابێ لەسەرئەم بیرۆکە هەڵەیە بێت کە خوێندنەوەی هزری ئوستورەیی تەنیا بەکاری توێژەرانی ئوستوورە دێت. ئەم دوونموونەیەی خوارەوە شایەتێکی ئاشکران بۆ ئەم بۆچوونەکە هزری ئوستوورەیی بەسەر زەینی زانایانیشدا زاڵ بووە. ***ئۆگست کۆنت*** یەکێ لەبنیاتنەرانی کۆمەڵناسی و فەلسەفەی پۆزیتیڤیزمە.

ئەودەبویست هەموو توخمە ئوستوورەیی و میتافیزیکییەکان لە هەرێمی زانست وەدەر بنێ. بەڵام سیستمەکەی کە بە وەدەرنانی هەموو توخمە ئوستوورەییەکان بۆ قۆناغی پێش زانستی یان سەرەتای قۆناغی زانستی دەست پێدەکات، بە سیمایەکی ئوستورەیی دەگاتە لوتکەی خۆی. مارکسیش پێی وابوو کە لەگەڵ هەر جۆرە هزرێکی ئایدیالیستی و یۆتوپیاییدا نییە. بەڵام رەوتی هزری مارکس وەکوو کانت لە فەلسەفەوە بەرەو ئوستوورەیە. (هەرچەند باشترە بڵێین کە هزری مارکس هەر لە سەرەتاوە گیانێکی ئوستورەییانەی تێدا هەیە.) کەواتە جیاکردنەوەی زانست لە ئوستووره کارێکی زۆرئەستەمە، بەتایبەت لە هەرێمی زانستە کۆمەڵایەتیی و زانستە مرۆڤایەتییەکاندا.



## پەراوێز

١- ئەم وتارە بەپێی ئەم دوو کتێبەی خوارەوە نووسراوە:

E. Classier, philosophies deer symbolist foramen, sweeter tail, Dash mystic Den ken (Berlin, 1925)

M.frankfort etal , the Intellectual Adventure of Ancient Man ( The University of Chicago press , 1964 ).

٢- شاهنامە فردوسی (چاپ دوم، مسکو ١٩٦٦) جلد چهارم، ص ١٩٥ (داستان کاووس کشانی، ابیات ٨٠ ــ ١٣٧٧)

٣- شاهنامە فردوسی (چاپ دوم ،مسکو ١٩٦٦) جلد یکم ،ص ١٤٥

A. Einstein , The Meaning Relativity (London, Methuen 1967 ),.1

B.

٤- ئەم کتێبە لەلایەن «محمد رضا خواجە پور»ەوە بەناونیشانی «مفهوم نسبیت» کراوەتە فارسی. (تهران، انتشارات خوارزمی، ١٣٦٢، ص ١٥٩ )

٥- تیۆری ژمارەکان باسەدژوارەکانی بیرکاری ومەنتیقی بیرکارین. بۆباسی تەواو لەبارەی ژمارەوە، بەتایبەت لە روانگەی« بیرتراند راسێل »،ەوە بڕواننە بەرهەمە بەپێزەکەی:

«بنەمـــاکانی بیرکاری (اصول ریاضیات )، بەتایبەت بەشی دووهەمی ( ص ١١١ ــ ١٥٣ ) و هەروەها بەشی سی وسێیەم: « اعداد حقیقی »، بەشی سی وچوارەم:« حدود واعداد گنگ» وفصل چل وچوارم: «ابعاد واعداد مختلف»





C. Ruseell, THE PRINCIPLES OF Mathematics (2nd edition 1936 Eighth Impression 1964 ).

بە بڕوای توێژەران، کتێبی گوتلەپ فرێگە، بنەماکانی زانستی بیرکاری، یەکەمین شیکردنەوەی ڕێك وپێکی فەلسەفییە لەبارەی چەمکی ژمارە لەکولتوری ڕۆژئاوادا.

Gotlob frege , Die Grundlagen der Arthmetik (English transation: The foundations of Arithmetic ) German Text with English trans lation by J.L. Austin , Basil Blackwell oxford 1978 ).

بێرتراند راسل لە بەرهەمەکەیدا « سەرەتایەك بۆ فەلسەفەی بیرکاری » لەبارەی کتێبی فرێگەدا دەنووسێ: « ئەم پرسیارەکە ژمارە چییە؟ زۆرجار هاتووەتە ئاراوە، بەلاّم تەنیا لەسەردەمی ئێمە دا وەلاّمێکی دروستی پێدراوەتەوە. فرێگە لە ساڵی ١٨٨٤ دا لە بەرهەمەکەی خۆیدا « بنەماکانی بیرکاری » وەلاّمی ئەو پرسیـــارەی سەرەوەی داوەتەوە. سەرەڕای ئەمە کتێبی فرێگە چڕە، بەلاّم دژوارنییە و یەکێ لە گرنگترین کتێبەکان لە باسی ژمارە دایە. سەرەڕای ئەمە کتێبەکەی فرێگە سەرنجی کەسی ڕانەکێشا وبەکردەوە بەنەناسراوی مایەوە تا ئەوەی کە نووسەر[ بێرتراند راسل ]ئەوەی لە ساڵی ١٩٠١ دا دەرخست.

B. RUSSELL , Introduction to Mathematical philosophy cllondon George Allen & Unwin firat edition 1919 , twelfth impession 1967 ), p.11.

لەبارەی ژمارەوە ئەم دوو بەرهەمەی خوارەوەش کاریگەرییان هەبووە:



1. R.Dedkind , Essays on the Theory of Numbers (English translation of "stetigkeit und Irrationalen zahlen" & was sind und was sollen die zahlen" ), New York Dover pub. 1963 ).
2. Gorge contor , contribution to the founding of Tranfinite Numbers (English translation New York Dover pob. 1955).

---

**سەرچاوە:**

زبان، اندیشه وفرهنگ (مجموعەی مقالات )، ترجمه وتألیف یدالله موقن، انتشارات هرمس، تهران ١٣٧٨.





## پێشەکی

« زمان، هزر وکولتور » وتارێکی بەناوبانگە لە بارەی تیۆرییەکەی *وۆرف* و یەکەمین وتارە لە کتێبی:

Paul Henle (ed.): Language, Thought and culture (The university of Michighan press , 1985) pp.1-24

*هۆمبۆڵت* پیی وابوو زمانەجۆرراوجۆرەکان، «تەنیا لە دەنگ و هێماکاندا جیاواز نین، بەڵکوو لەجیهان بینیەکانیشدا جیاوازن. »وۆرفیش لە سەرئەم باوەڕەیە. *توشیهیکو ئیزوتێسو* لە بەرهەمەکەی بەناونیشانی خودا ومرۆڤ لە قورئاندا (وەرگێڕانی: احمد آرام، تهران، شرکت سهامی انتشار ١٣٦١ لە پەراوێزی لاپەڕەی ٥ دا) دەنووسێ:

لە پێوەندی لەگەڵ دوا تیۆریدا [گریمانەکەی *ساپیر ـ وۆرف* ]چاو لە تۆێژینەوە رەخنەییەکەی مامۆستا *پۆل هێنلە* بکە لە کتێبی « *زمان، هزروکولتور*» دا. گوایە ئەم دوو رێبازە [واتە رێبازی هۆمبۆلت ورێبازی ساپیرـ وۆرف]، بۆماوەیەکی دوورودرێژ لە دووبەری ئەقیانووسی ئەتڵەسەوە، بەتاکە تیۆرییەکی زمانەوانییەوە خەریك بوون، بەبێ ئەوەی یەکتربناسن. بەلاّم *روبینز* لە کتێبەکەی خۆی بەناوی «*کورتە مێژووی*



*زمانەوانی*» (وەرگێڕانی علی محمد حق شناس، تهران ،نشرمرکز ، ١٣٧٠ )دا لە لاپەڕەی ٣٧٥) دا دەنووسێ: پێشتر ئاماژەکراوە کە لەزمانەوانیی ئەمریکیدا هێڵی راستەوخۆ لە هۆمبۆڵتەوە دەست پێدەکات ولە رێگەی *برینتۆنەوە* (کە وەرگێڕی هێندێ لە بەرهەمەکانی هۆمبۆڵت بە ئینگلیزییە ) *بوئاس* وساپیرەوە دەگات بە *بی.ئیل.وۆرف*.

هەڵبەت بێجگە لە هۆمبۆڵت، *لوسین لێڤی ـ برول وئێرنێست کاسیریریش* لە هێنانە ئارای تیۆریی رێژەیی زمان، لە وۆرف لە پێشتر بوون. تیۆریی رێژەیی زمان لەگەڵ تیۆری رێژەیی کولتور و تیۆریی مەعریفەناسیدا لە پێوەندییەکی نزیکدایە.

(١)

زۆرکەس زمان بە بابەتێکی ئاسایی دادەنێن.ئەوەیکە زمان بەپاراویی وسانایی بەکاردەبرێ، ئەو بیرۆکەیەی لامان دروست کردووە کە کانالێکی روونی گواستنەوەی هزرە؛چونکە لە روالەتدا کۆسپ ناخاتە بەردەم رەوتی بیرکردنەوەمان وپێمان وایە بەشێوەی یەکسان بۆگواستنەوەی هەموو جۆرە هزرێك دەکرێ بەکاربێت. لەبواری زانستیدشدا تەنیا ئەو زماننناس ودەرونناسانەی کە هۆگری هەڵدانی منداڵ یان ئافازیا (زمان گرتن)ن، حەزیان لێیەتی، ئەمانەوبەس. هێندێك لە زمانناس ومرۆڤناسان ئەم جۆرە تێگەیشتنە لە زمان رەت دەکەنەوە. *ئیدوارد ساپیر* بیست ساڵ بەرلە ئێستا لە سەرئەم باوەڕە بووە کە:

*بەخراپ لەپێوەندیی نێوان زمان وتەجرەبە تێگەیشتوون، ئەوەی کە ساویلکانە پێیان وایە زمان تەنیا رەشنووسێکی رێکخراوە لە نموونە جۆراوجۆرەکانی ئەزموون، کەدەکرێ بە بەڵگە وەربگیرێن، وانییە بەڵکوو پێکهاتەیەکی رەمزی وسەربەخۆ وداهێنەریشە کە نەتەنیا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوبرە ئەزموونەی کە بەشێکی مەزنی بەبێ یاریدەی زمان بەدەست هاتووە؛ بەڵکوو، زمان، بەپێی پێکهاتەی روالەتییانەی خۆی، ئاست وسنووری ئەزموونیشمان بۆدەست نیشان دەکات. دیسانەوە چونکە ئێمە نائاگایانە چاوەروانییە شاراوەکانمان کە بەهۆی هەبوونی زمانەوە تێیدا بەدی هاتوون دەگەڕێنینەوە بۆ هەرێمی ئەزموون، زمان ئەزموونمان بۆ دەخاتە چوارچێوەیەکی دیاریکراوەوە.*[1]

ساپیر، پێی وایە، پتەوی ئەم بۆچوونە کاتێك دەسەلمێ، زمانە هیندوئەورووپییەکان کە کەمتاکورتێك لەیەك دەچن، لەگەڵ ئەوزمانانەدا کەجیاوازییەکی بەرچاویان لەگەڵ ئەوانەدا هەیە، بەراورد بکەین؛ وەك زمانی دانیشتووانی خۆجێیی ئەفریقییا وئەمریکا.

*بینجامین لی وۆرف*، لەزنجیرە وتارێکدا[2] لەسەر ئەوبۆچوونەی ساپیررۆیشتووە. ئەو دەڵێ زمان جۆرێك مەنتیق و چوارچێوەی گشتی ئاماژە پێکردن پێکدێنێ وبەم شێوەیە هەر زمانێك سیما(شکل) بەهزری قسەپێکەرانی بەکارهێنەرانی خۆی دەبەخشێ. پاشان بانگەشەی ئەوەش دەکات لە هەر شوێنێك، کەکولتوورێك وزمانێك پێکەوە هەڵیان دابێ، گەلێ پێوەندی گرنگ لەنێوان لایەنە گشتییەکانی رێزمان و تایبەتییەکانی ئەو کولتوورەدا، بەگشتی، لە ئارادا هەیە. وۆرف بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونەی خۆی، زمانی سوور پێستە ئەمریکییەکان و بەتایبەت زمانی هۆپی[3] لەگەڵ زمانە ئەورووپییەکاندا بەراورد کرد. جیاوازیی زمانە ئەورووپییەکان لەگەڵ یەکتردا بە بەراورد یان بە جیاوازی لەگەڵ زمانی هۆپیدا ئەوەندە کەم بوو کە ساپیرئەوانەی بەناونیشانی گشتی زمانی ناونجی ستاندەری ئەورووپی[4] پۆلین کرد.

ئەگەر بۆچوونی وۆرف ولایەنگرانی راست بێت، تاوتوێکردنی زمان لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا ولە دەروون ناسیشدا دەورێکی گرنگتری دەبێت ولەهەموو توێژینەوە کولتورییەکاندا دەکەوێتە پلەی یەکەمی گرنگییەوە وتەنانەت لەوانەیە ببێتە ناوەندێك کە لقە جواروجۆرەکانی زانستە

کۆمەڵایەتییەکان بە دەوریدا کۆببنەوە. لەبەر ئەم هۆیە، ئەم بەشە بۆ تاوتوێ کردنی ئەم بۆچوونە تەرخان دەکەین وباسەکەمان بەتاوتوێ کردنی زاراوەکانی زمان و هزر و کولتوور دەست پێدەکەین وپاشان بەریز لەبارەی پێوەندیی زمان لەگەڵ هزرو پێوەندیی زمان لەگەڵ کولتووردا دەدوێین.

(٢)

لەبەر ئەوەیکە پێوەندیی نێوان زمان وهزر وکولتوور تارادەیەك بە پێناسە کردنی زاراوەکانی سەرەوە بەندە، کەوابێ سەرەتا ئەو زاراوەانە پێناسە دەکەین. بەرلەوەی بمانەوێ پێوەندیی نێوان هزر *وزمان* بسەلمێنین، دەبێ ئەم چەمکانە شی بکەینەوە. بەشێوەیەکی ئاسایی زمان نیشانەی سەرەکی هەبوونی هزر وچونێیتی هزرە وئەگەر بۆچوونەکەی وۆرف شتێکی زیاتر لە بۆچوونێکی ئاسایی و ئاشکرا بێت، دەبێ لایەنە تایبەتییەکانی زمان وهزر بەروونی لەیەکتر جیابکەینەوە.

لەوانەیە باشتر وابێت کە سەرەتا بەدوای ئەو لایەنانەی زماندا بچین کە دەکرێ بەروونی لە هزرجیابکرێنەوە و دەتوانن لەگەڵیدا بەراوردبکرێن. وشەکانی زمانێك، بەکۆی ئەووشانە دەگوترێ وا لە زمانێکدا هەن، لایەنێکی بەرجەستەی زمان وشەکانێتی و *دەکرێ بە بەراوردکردنی وشەکانی دووزمان لەگەڵ یەکتردا، تایبەتییەکانی هەرکام لەو دووزمانە دیاری بکەین، یان بەلای کەمی جیاوازییەکانی نێوانیان بەدی بکەین.* لەوانەیە بکرێ ئەم جیاوازییانە لەگەڵ ئەو جیاوازییانەی کە لە هزر و باوەڕەکاندا بە شێوەیەکی هاوبەش



لەدووزماندا دەردەبڕدرێن بەراورد بکرێن. خەسلەتێکی ئاشکراتری زمانەکان، شێوەی گەردانکردنیانە. لەوانەیە بکرێ لەم رووەشەوە زمانە جۆراوجۆرەکان پێکەوە بەراورد بکرێن بۆ ئەوەی ئەگەر جیاوازییە مۆرفۆلۆژییەکان لەگەڵ ئەو جیاوازییانەی لە ناو زمانەکە خۆیدا دەردەبڕدرێن پێوەندییان هەبێت، دەربکەون. *شێوەی پێکهاتنی رستەش توخمێکی زمانییە کە دەکرێ لە ناوەرۆکی زمان جیابکرێتەوە ولەگەڵیشدا شیاوی بەراوردکردنە. هێندێ جار ئەو زاراوانەی کە دیاردەی یەکسان لەزمانە جۆراوجۆرەکاندا دەردەبڕن، سەربە جۆرەکانی وشەن. بۆ نموونە لەوانەیە ئەوەی لەزمانێکدا لەرێگەی ناوەوە دەردەبڕدرێ لە زمانێکی دیکە دا لە کاردا بخرێتەروو. ئەم بوارەش جیاوازییەکی بەرچاوە، کە لەگەڵ ناوەرۆکی دوو زمانەکەدا شیاوی بەراوردکردنە.*

ئەو مەقوولەیەی کە لە رووی جۆرەوە بە هزرین ناوی دەبەین ،دەبێ هەم ئیدراك بگرێتەوە وهەم لەوانەیە بکرێ بەرێکخستنی چەمکییانەی ئەزموون ناوببرێ. کەواتە وۆرف دەڵێ لە زمانی شانی[٥] دا خاوێن کردنەوەی چەك بە شیش بەمجۆرە وەسف دەکرێ: «هیدایەت کردنی خاڵێکی بۆش وبزێوو وشك بەئامێرێك»[٦] ئەمجۆرە وەسف کردنە بێ شك جیاوازیی سیستمی بیرکردنەوە پێشان دەدات. لە زمانی ئینگلیزیدا جەخت دەخرێتە سەرئەشیا و ئەجسامی مادی، کەچی. لە زمانی شانیدا جەخت دەخرێتە سەرلایەنەکانی دیکە. بە پێی هێندێ بۆچوون، ئەگەر ئەو جۆرە جیاوازییانەی کەلەسیستمێکی بیرکردنەوە دا هەن، بەتەواوی پەرەپێبدەن دەگەنە فەلسەفەی جۆراوجۆر.

بەهەرحاڵ ئەوانە ئەو جیاوازییانە لە بیرکردنەوەدا پێشان دەدەن کە لەگەڵ جیاوازییەکانی زمانەکاندا لە پێوەندیدان.

دەست نیشان کردنی توخمەکانی زمان وهزر، کێشەی زۆری لەسەر نییە، بەلاّم کاتێ مەقولەی کولتوور هاتە ئاراوە. کێشەی مرۆڤناسی خۆ دەردەخات، بۆنموونە لەم بارەیەوە کە، کولتوور چ کاروبارێك دەگرێتەوە ؟ بەلاّم هەولّی ئێمە بۆ کۆتایی هێنان بەم کێشەیە نییە، بەڵکوو تەنیا دەمانهەوێ ئەو روانگەیە لە بارەی کولتوورەوە، بەشێوەیەکی کورت دەربڕین کە بۆ بەراورد کردنی کولتوور لەگەڵ زماندا لە روانگەکانی دیکە سوودبەخشتر بێت، بەلاّم بێجگە لەمە ئیمتیازێکی دیکە بۆ ئەم روانگەیە بەرەوانازانین. ئەم روانگەیە بەجۆرە کولتوور پێناسە دەکات: «*بەهەمەوو ئەوپلانانە دەگوترێ کە بەشێوەیەکی ئاشکرا یاشاراوە، چ ژیرەکی ،چ ناژیرەکی یان دژەژیرەکی وەك سەرمەشقی رێبەری کردنی رەوشتی خەڵك لە هەمەوو سەردەم ودەورانێکدا ئافرانێنراون*»[۷] لەم روانگەیەوە، کولتوور سەرمەشقی شێوازی ژیان یان سەرمەشقی رێبەری کردنە لەژیاندا کە بەسەر گروپێکی کۆمەلاّیەتیدا زاڵ بێت. نابێ ئەم نموونانە بە بابەتی جیاواز لە یەکتر دابنرێن، بەڵکوو چونکە لەبواری ئەرکی (فونکسیونێل)ەوە پێکەوە لەپێوەندی دان. ئەم مۆدێل و نموونانە پێکەوە لێکدەدرێن « بابەت »ی[۸] دیاریکراو دروست دەکەن. بابەتێك گشتاندن (تعمیم) ی ئاستێکی سەرترە. گشتاندنی ئاستە نزمترەکان راستەوخۆ لە سەر رەوشت دامەزراون و مۆدێلەکانی رەوشت پێکدێنن. گشتاندنی ئەم نموونانە، بابەت دروست دەکەن، هەر بابەتێك هێندێ چەمك دەگرێتەوە کە نموونەی بەرچاوی



ژمارەیەك لە مۆدێلەکانی رەوشتن. تەبایی بابەتەکان پێویست نییە وەهەروەك چۆن ئۆپلێر[۹] بینیوێتی، لەوانەیە لە کولتورێکدا بەپێی ئەو دووبابەتەی خوارەوە کاربکرێ[۱۰] «بەساڵدا چوویی پەسند وجێگای رێزە» و «هەمەوو کەس دەبێ پلەوپایەی خۆی لەرێگەی بەشداریکردنی لەو چالاکییانەی کە تایبەت بەپلەوپایەکەیەتی، جێ بخات.» لە راستیدا بەربەستێتی بابەتێك [تێم] کرداری بابەتی دژبەو، قەرەبووی دەکاتەوە وئەم کارەش بۆ مانەوەی کۆمەڵگە پێویستە.

کەواتە ئەو پرسەی وۆرف خستوویەتە روو، دەکرێ تۆزێ روونتربکرێتەوە وبەم شێوەیە دەربڕدرێ: چ پێوەندییەك لەنێوان میکانیزمەکانی زمان وەك وشەسازی، مۆرفۆلۆژی ورستەسازی لەگەڵ تێگەیشتن و رێکخستنی ئەزموون یان لەگەڵ نموونە بەربلاّوترەکانی رەوشتدا لە ئارادا هەیە ؟ ئەم پرسە تارادەیەکی شیاو دیاروئاشکرایە، مەگەر لەبارەی ئەو پێوەندییەوە کە ئەگەر (احتمال)ی لەئارادا بوونی هەبێ. ئاشکرایە کە شیاوترین مەبەست (کە کەمترین دەمەتەقییێ لەسەر دەکرێ) ئەمەیە کە پێکبەند [*Correlative*]ی وا بدۆزینەوە کە پیشان بدات دانەی زمانیی دیاریکراو بەهێندێ بواری دیاریکراوی کولتوور دەگۆرێن، ئەو پێکبەندانەی کە بەدەست هاتوون، پێیان ناوێ بیانبەستینەوە بەلەپێشداهاتنی هۆ (تقدم علی)وە. بەم پێیە لە لایەنێکی ئەم پێوەندییەوە دەکرێ بەرانبەر بەلایەنەکەی تریش بگەینە چەند ئاکامێك. بۆپیشاندانی پێوەندیی نێوان وشەکان وحەز ومەیلەکانی کۆمەڵگەیەك بەڵگەی راستەوخۆ لەئارادا هەیە، بەلاّم لەبارەی پێوەندییەکانی دیکەوە، بەڵگەهێنانەوە دژوارە. لە نموونەی ئاوادا بەڵگەی ناراستەوخۆ دەبێ

لەبەرچاو بگیرێ ؛وە شێوەی بەڵگەمەندکردنەکەش بەوجۆرەی لێدێ کە ئەگەر بەڵگەی زیاتر لە بەردەستدا دەبوو، دەکرا بوونی ئەم جۆرە پێکبەندییە بدۆزرێتەوە. پێش بینی کردنی ئەم جۆرە پێکبەندییەی نێوان هۆیە جۆراوجۆرەکان بە پێی پێوەندیی هۆیی بەدی دێت. تەنانەت بۆ پێوەندیی نێوان وشەو کولتوورەکان، ئەم جۆرە بەڵگانە یاریدەمان دەدەن کە بەڵگەی پێکبەندیی راستەوخۆ بدۆزینەوە. ئێمە گەلێ بەڵگەمان وەك بەشێك لە دەروونناسیی هەستی هاوبەشی خۆمان، لە بەردەستدایە تاکوو قانیع بین دەبێ گەلێك ووشەی هەبێ بۆ ئەو کاروبارانەی پێوەندی لەگەڵیاندا هەیە و بۆ ووشەی نەبێت بۆ ئەو کاروبارانەی کە پێوەندی لەگەڵیاندا نییە. کەواتە بەرانبەر بەم پێوەندییە، ئامادەییەکی پترمان هەیە کە قبوولی بکەین ئەو بەڵگانەی بەدەستەوەن تەواون.

ئەم باوەڕە کە لەنێوان زمان وکولتووردا پێوەندییەکی هۆیی لەئارادا هەیە، ئەوەمان بۆ روون ناکاتەوە کە کام یەك لەوانە لە سەر ئەوی دیکەیان کاریگەریی هەیە. لەوانەیە یەکیان کارای هۆیی ئەوی دیکەیان بێت ولەوانەشە هەردووکیان بەرهۆی هۆیەکی هاوبەش بن و یان لەنێوانیاندا دوو کردەی هۆیی بەرانبەر بەیەکتر لە ئارادابن. لە راستیدا، بە لەبەرچاوگرتنی ئەو بابەتەی کەزمان وکولتوور دوو فاکتەری پێکەوە لکاو و،بەردەوامن، لە ئارادابوونی پێوەندییەکی هۆبەندییانەی بەرانبەر بەیەکتر، پەسندترە و ئەو پێوەندییانەی لە مەودا باسی دەکەین، پتر پێوەندییەهۆبەندییەکان دەبێت.



## (٣)

ئێستا دوای ئەو کورتە باسەی لەبارەی هۆیە گاریگەرەکان کرا، دەکەوینە پێوشوێنی ئەو بەڵگانەی دەمانەوێ بوونی ئەم پێوەندییانەیان پێ بسەلمێنین. بۆ ئەم مەبەستە گونجاوترین رێباز ئەوەیە کە بەڵگە بۆ پێوەندیی نێوان زمان وهزربێنینەوە وباسەکەمان بەپێوەندیی نێوان وشەکان وتێگەیشتن (ادراك) دەست پێبکەین. زمانەکان بەئاشکرا لە رووی وشەوە لەگەڵ یەکتردا جیاوازن وئەم جیاوازییە بەشێوەیەکی گشتی، بەجیاوازیی ژینگەی قسەکەرانی ئەو زمانانەوە گرێ دراوە. بۆ نموونە وۆرف سەرنجی ئەم خاڵەی داوە کە زمانەکانی ئیسکیمو وشەی جۆراوجۆریان بۆجۆرە جیاوازەکانی بەفرهەیە؛ کەچی لە زمانە ئەورووپییەکاندا تەنیا وشەیەك بۆبەفرلەئارادا هەیە؛ بەلاٚم زمانی ئازتێك[١١] لەم بوارەوە تەنانەت لە زمانە ئـــەورووپییەکانیش هەژارترە؛ چونکە رەگی یەك وشە بۆ سەرما، سەهۆڵ و بەفر بەکاردێنێ:[١٢] ساپیرگەلێ بەڵگەی بەرامبەربوارێکی بەربلاٚوتر دەخاتەروو وپێی وایە کە وشەکانی زمانێك، بەئاشکرا، ژینگەی جوگرافیایی وکۆمەلاٚیەتیی گەلێك دەنوێننەوە. لەراستیدا گشت وشەکانی زمانێك « رەشنووسێکی ئالۆزن لە هزر، بیرۆکە و ئەو حەزو پیشانەی کە سەرنجی ئەو گەلەیان بەرەو لای خۆیان راکێشاوە...»[١٣] هەروەها ئاماژەش دەکات لە زمانی گەلی *نوتکا*[١٤] دا

کەلە لێواری دەریاکانی باکووری رۆژئاوای ئەمریکا دەژین، گیانلەبەری دەریایی بەوردی پێناسە دەکرێ ورەمزی بۆ دادەنرێ. هێندێك لە گەلانی بیابان نشین زانیاریی زۆریان لە بارەی دانەوێڵە وگیای تری شیاوی خواردنیان لا هەیە، هەروەها زمانی گەلی پایی یوت[١٥]، کە گەلێکی بیابان نشینە، دەتوانێ تایبەتمەندییە جوگرافیاییەکانی بیابان بەدرێژە وەسف بکات وئەم کارەش لە سەرزەمینێکدا کە دەست نیشان کردنی شوێنی چالاوەکان پێویستیی بە زانینی گەلێ نیشانەی ئالۆزە، زەرووره. ساپیر ئەمەش باس دەکات کە ئەوەی لەبارەی ژینگەی سروشتییەوە راستە بەشێوەیەکی ئاشکراتر لە بارەی ژینکەی کۆمەڵایەتیشەوە بەراست دەگەڕێ؛ لەکولتووری جۆراوجۆردا پلەوپایە کۆمەڵایەتییەکان بەرێك و پێکی بەهەمەوو ئالۆزییەکانیانەوە و هەروەها جیاوازییە پیشەییەکانیش بەتەواوی لەزمانەکەیاندا رەنگدەدەنەوە.

تائێرە بەڵگەهێنانەوە تەنیا ئەمەی دەرخستوە کە، وشەکان ژینگەی گەلێك نیشان دەدەنەوە. چونکە کولتوور بەتایبەت لە شوێنێکدا کە پیشەسازی گەشەیەکی ئەوتۆی نەکرد بێت، بەچڕی بەژینگەوە بەندە، کەواتە بەڵگەیەك بە دەستەوە هەیە ئاماژە بەم خاڵە بکات، کە لانی کەم وشەکان وشێوازەکانی کارکردن، بەرهۆی هۆیەکی هاوبەشن، کەواتە هەرکامە دەتوانێ نوێنەری ئەوی دیکەیان بێت.

بەڵام ئەو باسانەی سەرەوە، لەتێگەیشتن نادوێن. ئەگەر مەبەست لەتێگەیشتن، تەنیا تۆمارکردن وراگرتنی بابەتە پێشکەشکراوەکان بێت، لەوەی تا ئێستا باس کرا پێوەندییەکی ئەوتۆی لەگەڵدا نییە. بەڵام لەراستیدا



وانییە، چونکە بەڵگەی زۆر لە ئارادا هەن کە پیشان دەدەن تێگەیشتن لەژێر کاریگەریی سیستمی زەینی[١٦] دایە. برونێر[١٧] و گودمەن[١٨] لە وتارێکدا کە ئێستا کۆن بووە، کاریگەرییەکانی سیستمی زەینیان [لەسەر تێگەیشتن] کورت کردۆتەوە. ئەمانە دەڵێن:

دەکرێ تاکەکان بەرانبەر بەدیتنی شتەکان وبیستنی دەنگەکان بەهەمان شێوە هەستیار بکرێن کە لە بەرامبەر هێندێ دیاردەی وەك؛ پەڕینی ئەژنۆ یان برژۆڵ یان هاتنی لیکاودا دەبن. هەر توێژەرێکی بواری « تەلقین»، چ ئەو سەرچاوە زۆرانەی کە برد[١٩] لەبارەی ئەم بابەتەوە کۆی کردونەتەوە، تاوتوێ کرد بێت یان نەکردبێت، ئەوە دەزانێ کە ئەگەر وێنەیەکی کەم رەنگ بۆچەندین جار هاوڕێی لەگەڵ دەنگدا بەکەسێك پیشان بدەن، ئەگەر لەپاشاندا وێنەکە لابەرن و دەنگەکە بەردەوام بێت، کەسی ناوبراو پێی وایە کە وێنەکەش دەبینێ. ئەمە تێگەیشتن نییە؟ کەسی ناوبراو ئەو شتەی کە دەبینێ بە هەمان روونی دەیگێڕێتەوە کە دیاردەی فای ( *Phi – phenomenon*)[٢٠] دەیگێڕێتەوە[٢١].

سەرەرای ئەمەش ئەوان پێیان وایە کە پاداش و سزا، ئەزموون و هۆیە کۆمەڵایەتییەکان، دەتوانن لەسەر شێوەی تێگەیشتن کاریگەر بن و توێژینەوەکانیان دەریدەخات کە منداڵانی سکەکان لە ئەندازە راستەقینەکایان گەورەتر مەزندە دەکەن؛ بەشێوەیەك کە هەرچەندی نرخی سکەکە زیاتر بێت، رادەی خەتاو بەهەڵە چوونەکەش لە مەزندەکردندا پتر دەبێ. دیسانەوە هەڵە کردن لە مەزەندە کردنی ئەندازەی سکەکاندا لە ئەندازەی کارتۆنە بڕاوەکانی هاو ئەندازەیان پترە. رادەی هەڵە کردن لە منداڵە هەژار ودەست کورتەکاندا

پترە تا منداڵانی دەوڵەمەند وتێر وتەسل. هەروەك ئەوان ئاماژەی پێدەکەن کەسی درکپێکەر (مدرك) نابێ «وەك ئامرازێکی تۆمارکردنی بیّ دەسەلاّت دابنرێ کەتەنیا نەخشەیەکی ئاڵۆزی هەیە و بەس». کەواتە پرسیارەکە بەم جۆرە دەخرێتە روو کە ئاخۆ زانیینی وشەیەك لە وشەکان کە وا بەلانی کەمەوە لەئەزموونی هەستەکاندا بەکار بێت، کۆمەڵەیەکی ئەوتۆ پێکدێنێ کە ئیدراك بەرەو روخساری ئەو وشەیە رابکێشێ؟ هەبوونی کۆمەڵەیەکی ئاوا بەم واتایەیە کە تەنیا ئەو بوارانە لەژینگە دەبینرێن کە بە بەکارهێنانی ئەو وشەیەوە بەند بن. بەلاّم لەبواری دیکە دا بە نەبینراوی دەمێننەوە. لەبارەی ئەم خاڵەوە بەڵگەی راستەوخۆ لە بەردەستدانییە، بەلاّم مەزەندەی ئەوە دەکرێ کە کۆمەڵەیەکی ئاوا لەئارادا هەبێ. پاڵنەرێکی بەهێز هەیە لە منداڵاَن و ئەو کەسانەی کە تازە هاتوونەتە کۆمەڵەوە، بەرامبەر بە فێربوونی زمانی ئەو کۆمەڵە هەیە. چونکە تەنیا لە رێگەی زانینی زمانەوە دەکرێ پێویستییەکان بەراورد بکرێن ولەگەڵ ئەوانی دیکەشدا پێوەندی دابمەزرێ. کەواتە توانایی بەکارهێنانی وشەکانی زمانێك پاداشتی لەدووە وئەم پاڵنەرە بەم داهێنانە کە وشەکان لەتاوتوێ کردنی ژینگەدا بەکەڵکن، بەهێزتر دەبێ. ئەگەر ئەم پاڵنەرە بۆفێربوونی زمان لەئارادا بێت، کەواتە بە ئاکام وەرگرتن (استنتاج)ی ئەو کۆمەڵەیەی کە یاریدەی بەکارهێنانی زمان بدات مەعقول دەبێ وئەم کۆمەڵەیە لەسەر تێگەیشتن کاریگەریی دەبێت.

هەربۆیە بە بەپێی ئەو زانیارییانەی لە سەرچاوەی ترەوە لەبارەی کۆمەڵەی زەینییەوە دەیزانین، دەکرێ هێنانە ئارای ئەم باسە لەگەڵ ئەوەی تـائێستا گوتراوە بەتەبا دابنرێ کەجیهان بۆ ئەوکەسانەی وشەی جیاواز



بەکاردێنن، جیاواز دەردەکەوێ. زمانی جۆراوجۆر سەرنجی بواری جیاوازی ژینگە دەدات. لەم بارەیەوە دەکرێ ئاماژە بە نموونەی زۆر بکرێ ! بۆنموونە لەزمانی گەلی ناواهۆ[٢٢] دا ناوی رەنگەکان لەورەنگانە دەچێ کە بە«سپی»، «سوور» و « زەرد » ناویان دەبەین، بەلاّم هیچ وشەیەکی کە هاوتای «رەش»، «خوڵەمێشی [ = رەساسی ]»، « خەنەیی »، « شین » و «سەوز» بێت لە ئارادا نییە. بەلاّم دوو وشەهەن کە لە « رەش » دەچن، یەکیان رەشێکی تۆخە و ئەوی دیکە یان رەشێکی کاڵترە وەك رەنگی *رەژوو*. بۆ ئەو رەنگانەی کە لای ئێمە بە «خۆڵەمێشی» و« خەنەیی »ناو دەبرێن، لەوزمانەدا تەنیا یەك وشە و، بۆ« شین » و «سەوز» یش تەنیا وشەیەك هەیە. تا ئەو جێیەی پێوەندی بەوشەکانەوە هەبێت، دابەشکردنی شەبەنگی رەنگەکان لای گەلی ناواهۆ لەگەڵ دابەشکردنەکانی ئێمە جیاوازە. لەوانەیە تێگەیشتن (ادراك)ی ناواهۆیی لەجیاوازی دانانی نێوان دوورەنگی «خەنەیی» و «خۆڵەمێشی»دا خۆی زۆر زەحمەت نەدا، کە ئاخۆ ئەو رەنگەی دەیبینێ کامەیانە !؟ تاکی گەلی ناواهۆ لە بارەی ئەمەوە کە ئاخۆ رەنگی ئەوشتەی لە بەر رۆشناییەکی کەمدایە شینە یان سەوزە، نەتەنیا دمەتەقێ ناکا بەڵکوو تەنانەت لەنێوان رەنگی شین و سەوزدا جیاوازی دانانێ.

هەڵبەت لەم نموونەیە نابێ وا تێبێنی بکرێ کە تاکەکانی گەلی ناوهۆ لە جیاوازی دانانی ئەو رەنگانەی کە بۆ ئێمە ئاشنان داماون. ئەوان لە ئێمە پتر تووشی «کوێررەنگی» نەبوون، چونکە ئێمەش ئەو وشانەمان نییە کە دوو جۆر رەشی دەربڕن کە ئەوان، ئەو دووە بە جیاواز دادەنێن. خاڵێکی تری دەمەوێ ئاماژەی پێبکەم ئەوەیە کە وشەکانی ئەوان، بەرەو ئەو لایەیان

دەبات کە ئەو جیاوازییانەی ئێمە ئاسایی دەیانبینین لە بەر چاوی ئەوان شاراوە بن.

ئەگەر ئەم بۆ چوونەمان ڕاست بێت کە وشەکان، لە سەر تێگەیشتن کاریگەرییان هەیە، دەبێ چاوەڕوانی ئەوەش بین کەلە سەر بوارەکانی دیکەی هزریش گاریگەربن. دابەشکردنی ئەزموونەکانی ئێمەش بەوەوە گرێ دراون کە چۆن لە بابەتەکان تێدەگەین، کەواتە دابەشکردنەکانیش وەکوو تێگەیشتن دەکەونە بەر هەمان کاریگەریی زمانییەوە. دیسانەوە واچاوەڕوان دەکرێ کە کاریگەریی لە هەردوو ڕووەوە بێت. ئەگەر بۆ بیرکردنەوە بەرانبەر بە جیهان، بیرۆکەی دەست نیشان کراو بەکاربێنین، دەبێ ئەو بیرۆکانە بە شێوەی ڕاستەوخۆ یان لەڕێگەی خواستن (استعارە)وە بخەینە سەروشەکان و لەوانەیە ئەم کاریگەرییە بکەوێتە پێش کاریگەرییەکانی دیکە. ئەگەرچی کاتێك کەزاراوەیەك لەوشەکاندا بێت، ئەو زاراوەیە هەم لەسەر تێگەیشتنی هەستی وهەم لەسەر تێگەیشتنی چەمکییانەش کاریگەر دەبێ.

گەردانکردن (صرف)ەکانیش لە ریزی ئەو بوارە زمانییانەدا دانراون کە لەوانەیە لەسەر هزر گاریگەرییان هەبێت. چونکە شێوە ڕێزمانییەکان کەمتر لە وشەکان دەگۆڕدرێن. کەواتە کاریگەریی مۆرفۆلۆژی، ئەگەر هەبێ، بەرچاوتر دەبێ. ئێمە پێمان وایە کە کاریگەرییەکی ئاوا لەئارادا هەیە و وەك کاریگەریی وشەکانیش وایە. گەردانەکان سەرنجی ئێمە بەسەر هێندێ بواری دیاریکراوی ئەزموون پتر لە بوارەکانی دیکەیدا رادەکێشن وچڕدەکەنەوە ولەم ڕێگەیەشەوە لە سەر تێگەیشتنمان کاریگەر دەبن.



لەوانەیە بەیاریدەی نموونەیەکی گریمانەیی، بکرێ شێوەیەك شرۆڤە بکرێ کە گەردانەکان زۆرتر بەپێی ئەو شێوەیە کاردەکەن. گریمان کە ڕەگی کاری بۆ نموونە A مان هەیە و واشی دابنێین کە لە قۆناخی سەرەتایی زمانەکەدا، تەنیا Aخۆی بەکارهاتووە. گریمان کەلە قۆناخی دواتردا وا باشتر بووە کە نیشاندەرەکانی کاتی ڕێزمانی[٢٣] بخرێنە سەر کارەکە تاکوو کاتی ڕابردوو، ئێستا و داهاتوو نیشان بدەن. ئەم نیشاندەرانە دەکرێ بە شێوەی پاشگرەکان بخرێنە سەر ڕەگی کارەکە وبە شێوەی Ax، Ay، Az پیشان بدرێن. چونکە لە هەر بارێکی پێش ئەمەدا، A خۆی بەتەنیا بەکاردەهات، ئێستا بەپاشگرەوە بەکاردێت؟ کەواتە ڕوون و ئاشکرایە کە گەردانکردن (صرف) دەکرێ سووك وسادە بکرێتەوە. لەبواری کاتی ڕێزمانییەوە ئیتر پێویست بە ڕەگی کارەکە خۆی (واتە A) ناکات، چونکە لە جیاتی A یەکێ لە شێوە پاشگردارەکانی بەکاردێت. بەلاّم درکاندن (بێژکردن)ی خۆی لە سیما پاشگردارەکانی دیکەی، ئاسانترە. کەواتە سروشتییە کە ڕەگی کاری (A) لەجیاتی یەکێ لە سیما پاشگردارەکانی و بەواتای ئاخردانەیان بەکار بێت. بەم شێوەیە Ax دەتوانێ سووك و سانا بکرێتەوە ولە شێوەی A دا دەرکەوێ. ئەگەرچی کارێکی ئاوا لە گفتوگۆدا شیاوە، بەلاّم کاریگەرییەکەی لەسەر زمان ئەمەدەبێت کە زمانەکە لەو وشەیە بێبەش دەکات کە بەواتاکۆنەکەی A بێتەوە. لەوانەیە ئەم کارەی زیانبەخش نەبێت، بەلاّم دەبێتە مایەی ئەوەی کە بەکارهێنانی زمان پێویستی بە بیرکردنەوەی زیاتر هەبێ. ئیدی ناکرێ بە سانایی تێبگەین کە دۆخەکانی بەکارهێنانی ڕەگی کاری (A) لە ئارادا هەبووە و A بەکاربراوە. چونکە ئێستا پێویستی بەکارهێنانی زمان،

تێگەیشتنی ئەم خاڵەشی پێدەوێ کە کام یەك لەو پاشگرانە دەبێ بەکاربێت. کاتێ دەکرێ، باس لە بوارێکی ئەزموون بکرێ، کە بوارەکەی دیکەشی بینرابێ وباسی لێوەکرابێ. دەکرێ ئەمەیان بە بینیێکی پێویست (مشاهدەی الزامی) ناوبەرین کە بەهۆی مۆرفۆلۆژیی (گەردانکردن) ەوە دەنوێندرێ کاتی رێزمانی کە لەسەرەوە باسی کرا، تەنیا جۆرێك لەبینینی پێویست پیشان دەدات. ئاشکرایەکە بەکارهێنانی کار لەزمانی ئینگلیزیدا پێویستی بەچەند دەرکەوتنێکە. هەم لەرووی ژمارە وهەم لە رووی رەگەزی کەسەکەوە.

زاراوەی بینینی پێویست، نابێ بەم واتایە وەربگیرێ کە ئاخێوەری زمانێك دەزانێ کە ناچارە تەنیا چەند لایەنێکی دیاریکراوی دەوروبەری خۆی ببینێ. زۆرجار بەشێوەی سروشتی ونائاگایانە ئەم بینینانەی خۆی دەکا، بەلاَم بێگومان لە دیتنیاندا هیچ جۆرە پێویستییەك هەست پێناکات؛ هەڵبەت لێرەدا هێزێکی بەرجەستە یان فیزیاوی لەئارادانییە. هەرچەند لەوانەیە کەسێك وشەی ئێنگلیزی بەبێ لە بەرچاو گرتنی جیاوازییەکانی کاتی رێزمانییان و رەگەزی کەسەکەیان بەکاربێنێ ولەهەل ومەرجی لەباردا مەبەستەکەی بگەیەنێ؛ بەلاَم لە باری ئاسایی و نالەباردا ناتوانێ مەبەستەکەی بگەیەنێ و لەم بوارەدا دەکەوێتە بەرتانەو توانجی بەرانبەرەکانی. ئەم نموونەیە تەنیا پەیوەست بوونێکی دەرەکی پیشان دەدات؛ بەلاَم بەکارهێنانی زمان بەپێی عادەت، پەیوەست بوونێکی دەروونی بەدی دێنێ.

ئەو بینینانە (مشاهدات)ی بە سەر ئاخێوەری زمانێکدا دەسەپێن، بەرێژەی زمانەکان جیاوازن. هەر بۆیە کلوکۆهان[٢٤] ولەیتۆن[٢٥] زمانی ئینگلیزیان لەگەڵ زمانی ناواهۆییدا بەراورد کردووە ودەڵێن:



زمانی ئینگلیزی لە روانگەی ئاخێوەرانی زمانی ناوا هۆییەوە، زمانێکی کلۆڵ وناتەواوە؛ چونکە بنە، زۆر لێڵ وتەماوی دەردەبڕێ. وەك ئەم رستەیە: من ئەوە دەهاوم. زمانی ناواهۆیی چوار تایبەتمەندی دەست نیشان دەکات کە زمانی ئینگلیزی بە نەگوتراوی دەیانهێڵێتەوە یا وەرگر دەبێ لە رووی دەقەکەوە تێیان بگات:

١/سیمای رستەکە دەبێ دەریبخات کە (ئەوە) ناسراوە یا نەناسراوە.

٢/ رەگی کارە بەکارهاتووەکە دەبێ بگۆڕێ بەپێی ئەوە کە شتەکە خڕە، درێژە، شلە یان گیانلەبەرە و تادوایی.

٣/ ئەم بوارانە دەبێ دەست نیشان بکرێن کە ئاخۆ کاری هاویشتنەکە رووی داوە یان خەریکە روودەدات یان کاتی وەستانی گەیشتووە؟ ئاخۆ کاری هاویشتنەکە بە هەڵکەوتبووە یان بەردەوام دووپات دەبێتەوە؟

٤/ دەبێ ڕادەی دەسەلاَتی ئەو کەسە دیاری بکرێ کە شتەکە دەهاوێژیی, بەسەرکەوتنە خوارەکەیدا[٢٦]

دۆرۆتی لیی [٢٧] دەڵێ لەزمانی وینتوو[٢٨]ییدا، بەهەمان شێوەی زمانی ناواهۆیی، پێویستە لەرێگەی پاشگرەکانەوە نیشان بدرێ کە ئەو بەڵگانەی هەواڵێك لە سەریان دادەمەزرێ چین و بەم شێوەیە زمانی وینتوویی بینینێك بەسەر ئاخێوەردا دەسەپێنێ. خانمی *لیی* دەنووسێ:

وینتوویی بە سانایی ناتوانێ بڵێ: قەشە ماسی باشە. بەشی باشە لەم رستەیەدا، کەکاتی رێزمانی (ئێستا) و کەس (ماسی) دەردەبڕێ، پێویستی بە یەکێ لەم روونکردنەوانەی خوارەوەیە: من دەبینم کە قەشە ماسی باشە، من دەیچێژم کە قەشە ماسی باشە؛ (یان ئەم بابەتە لەرێگەی هەستێکی

دیکەی جیا لەدیتنەوە دەزانرێ): من پێموایە کە قەشە ماسی باشە، من وای هەڵدەسەنگێنم کە قەشە ماسی باشە یان من بیستوومە کە قەشە ماسی باشە.[٢٩]

دەکرێ بگوترێ راست وەك نموونەی وشەکان، بینینە پێویستەکان (مشاهدات الزامی) کە گەردان (صرف)ەکان دەسەپێنن کۆمەڵەیەکی زەینی پێکدێنن. دەبێ بڵێین لەزمانی ئینگلیزیدا کاتی روودانی کردە، لە بەراورد لەگەڵ زمانی وینتوویدا سەرنج راکێش ترە. لەزمانی ئینگلیزیدا دەکرێ بەسانایی و بەبێ پێشکەشکردنی بەڵگەکان هەواڵ بدرێ؛ کەچی پێدەچێ زمانی وینتوویی لەم رووەوە هۆشیارتربێ. لێرەشدا ئەم کاریگەرییە وەك کاریگەریی وشەکان وایە، بەم جیاوازییەوە کە کاریگەرییەکە لەسەر چەند دانەیەکی کەمتر چڕبۆتەوە، ئەو دانەیانەی کە بناغەی مۆرفۆلۆژی (گەردانکردن) پێکدێنن کاریگەری مۆرفۆلۆژیان لەسەر زۆرترە.

سەرەنجام لە ژێر ناونیشانی زماندا، کارا دەبێتەوە مایەی رۆنانی رستە. کەچی دیسانیش واپێدەچێ سەرەتا، هزرو پێویستییە کۆمەڵایەتییەکان لەسەر رۆنانی رستە کاریگەربن، بەلاّم لەوانەیە پێچەوانەی ئەمەش راست بێ. ئەگەر زمانی ئینگلیزی، وبەشێوەیەکی گشتی زمانی ناونجی ستاندەری ئەورووپی لەبەرچاو بگرین، دوو جۆر رستە باون. یەکەم ئەو رستانەی کە دەکرێ لە جۆری گوزارەی {بنە (موضوع) ــ بار (محمول)}دا دابنرێن، و نموونەکەیان لەرستەی ئەم کتێبە سوورە دا دەردەکەوێ. دووهەم ئەورستانەی کە دەکرێ لە جۆری {کارا(عامل) ــ کردە(عمل) }دا دابنرێن، وەك: جۆن هەڵدێ یا جۆن مێری خۆش دەوێ. لەرستەکانی نموونەی یەکەمدا کارێك ناکرێ بەڵکوو تەنیا



سیفەت یان چۆنێتی (حاڵەت)ێك دەدرێتە پاڵ بنە (بکەر)ەکە. لەرستەکانی جۆری دووهەمدا، بنە(بکەر) بەکارا دادەنرێ. بەلاّم لە هەردوو جۆرەکەدا، بنە شتێکە کە لە رەوتی کاتدا پێناسە دەکرێ وبەردەوامی تێدایە. تەنانەت کاتێك کە بنە بەو واتایە شت (شیء)یش نەبێت، دیسانیش ئەم مەیلە لەئارادا هەیە کە بەجۆرێك باس لە بنە بکرێ کە گوایە شتێکی سەقامگیر(پایدار)ە. بەم پێیە فیتەرێك وا لە تەنزیمی موتۆری ئوتۆمبیل دەدوێ کە لە تایەکانی دەدوێ، هەڵبەت تەنزیمی موتۆڕەکە ئەو پێوەندییەیە کە لە نێوان گەڕانی بەشەکانیدایە، کەچی تایەی ئوتۆمبیل شتێکی مادییە. رەنگە بگوترێ کە ئەم شێوە لێدوانە لەبارەی رێك و پێك کردنی موتۆرەوە خواستنیانە (استعاری)یە ولەوانەشە وابێت، بەلاّم خاڵە جێگای سەرنجەکە لەوەدایە کە ئەم خواستنە لە رێگەی چەمکی شتە مادییەکەوە پەیدادەبێ.

ئەم روانینە، لەزمانی ئێمەدا باوە، بەشێوەیەکی، وا لە رووداوەکان دەدوێن کە گوایە ئەوانە شتی بەردەوامن و لە ئاخاوتندا وا پێدەچێ کە بەشی سەرەکی سەیالێتی ئەزموونی تێپەڕ دەفەوتێ. ئەم تێڕوانینە، هەروەك وۆرف بینیویێتی، تەنانەت لە زەمەنیشدا پەرە دەستێنێت. ئێمە وا لەکات دەدوێین یان لەبارەیەوە بیردەکەینەوە گوایە جەوهەرێکە کە پانتایەکی نادیاری هەیە. لەوانەیە بەشێکی، بەهەمان واتا جیا بکەینەوە کە نانی رشتەی سۆسیس دەبڕین، یان هەر وەك چۆن کوتە گۆشتێك پاشەکەوت دەکەین بە هەمان واتا دەست بە پێنج دەقیقە کاتەوە دەگرین، دەرباز نەبێت.

ئەم رێبازانە کە لە رێگەی ئەوانەوە دەروانینە جیهان، نەتەنیا لە رێکخستنی بەشەکانی ئەزموونندا، بەڵکوو لە فەلسەفە و بەتایبەتیش لە

مەنتیق و میتافیزیکیشدا گرنگن. مەنتیقی کلاسیك شێوەی گوزارە (بنە ــ بار)ی بەسەرەکی دادەنا وجەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە هەر رستەیەکی مەنتیقی دەبێ بەم شێوەیە بێت. لە رستەی وەك (جۆن مێری خۆش دەوێ) دەبێ بەجۆرێك بگوردرێ کە خۆشویستنی مێری بدرێتە پاڵ جۆن. لە مەنتیقدا بەڵگە جۆراوجۆرەکان پۆلێن دەکران ولە چوار چێوەی پێوەندییەکانی نێوان بنە (موضوع) وبار (محمول)دا تاوتوێ دەکران. هەرچەند تێگەیشتنێکی مەنتیقیانەی ئاوا لە سەردەمی ئێمەدا، کەمتاکورت، بەتەواوی رەتکراوەتەوە بەلاّم گومانی تێدا نییە کە پێوەندیی بنە و بار تا ئەم سەدەیەش کاریگەرییەکی مەزنی لەسەر هزری [رۆژئاوا] هەبووە.

لە میتافیزیکدا چەمکی بنە وبار بەشێوەیەکی دیکە دەردەکەوێ. کێشەیەکی کلاسیکی فەلسەفە، پێکەوەلکانی تێگەیشتنی هەستی (ادراك حسی) و رێکخستنی بووە. فەرق ناکات کە تێگەیشتنی هەستییانە بەش بەش یان بەشێوەی گشتێك [= گشتاڵت] ئاراستە کرابن. ئەمە ئێستاش لەئاراداماوە کە بینینەکان (مشاهدات)ی سەردەمێك لەگەڵ بینینەکانی سەردەمێکی دیکەدا چۆن پێکەوە پەیوەست دەبن. وەلاّمی کلاسیکییانەی ئەم پرسە کە بەشێوەی تەواو لە بەرهەمەکانی ئەرەستوودا پەروەردەکراوە، ئەمەیە کە جیهان لە جەوهەرەکان پێکهاتووە وهەرشتێك کە بەبیرمان دا بێت رواڵەتی (عرض)جەوهەرێکە. جەوهەرەکان یان جەوهەر(واتە ئەم پرسە کە ئاخۆ تەنیا یەك جەوهەرلە جیهاندا هەیە یان جەوهەری جۆراوجۆر، بە بۆچوونی فەیلەسووفەوە بەندە) وەك شتێك وێنادەکران کە لە رەوتی زەمەندا بەردەوام و تەنانەت لە هێندێ بوارەوە نەمر بوون. لەسەر ئەم بنەمایەش جەوهەرەکان، تێگەیشتن



(ادراك)ەکانی سەردەمێکیان لەگەڵ تێگەیشتنەکانی سەردەمێکی دیکە پێکەوە گرێ دەدا. بەم پێیە هەراوترین وەسفی جیهان، بەپێی نەریتی فەلسەفی رۆژئاوا ئەمە بووکە بڵێین جیهان لە جەوهەرو رواڵەت (عرض)ەکانیان پێکدێت.

تەریب بوونی نێوان جەوهەری مێتافیزیکی کەچەند رواڵەت (عرض)ێکی هەبوو (یان بەهۆی ئەورواڵەتانەوە ساخ دەکراوە )لەگەڵ بنە لە مەنتیقدا کە چەند بارێکی هەبوو (یان لە رێگەی ئەو بارانەوە ساخ دەکراوە ) ئەوەندە ئاشکرا بوو کە زۆرجار جەوهەریان وەك شتێك پێناسە دەکرد کە بەردەوام بنەیە وهیچکات نابێتە بار؛ بەپێی ئەم تەریب بوونە، رواڵەتەکان لە بنەکان دەچوون.

بەشێکی سەرەکیی فەلسەفەی سەدەی بیستەم دەمەتەقێ بووە بەدژی ئەم جۆرە تێبینییانە. شوێنی مەنتیقی کۆن بە مەنتیقێك پربۆتەوە کە رێگەدەدات بارێك، چەند بنە پێکەوە پێوەندبدا. لەم مەنتیقەدا، گشت چەمکی بنە ئیدی ئەو گرنگییە کلاسیکییەی نییە. لە میتافیزیکدا ئەو نووسەرانەی هزرە فەلسەفییەکانیان لەگەڵ یەکتردا جیاوازییەکی بەرچاویان هەیە، وەك *وایتهێد، راسل و بێرگسون* لەسەر ناکردن ورەتکردنەوەی هاوکێشە کلاسیکییەکانی جەوهەر هاوڕان. هەم تەریبێتی نێوان جەوهەر وبنە وهەم پێوەندیی نێوان مەنتیقی کلاسیك و رێزمان مەحکوم کراوە. هەر بۆیە راسل پێداگرانە دەڵێ: «بەکورتی، هەڵەیەکی میتافیزیکیانەیە بەهۆی رۆنانی ئەورستانەی کە لە بنە و بار پێکهاتوون، هاتوونەتە نێو رۆنانی جیهانیشەوە»[٣٠] ئێستا کە پێوەندیی نێوان زمانی ناوەنجیی ستاندەری ئەورووپیمان لەگەڵ فەلسەفەدا بینی، دەگەڕێینەوە سەر ئەو بەراوردکردنەی

وۆرف کە لە  نێوان ئەم دووە ولەگەڵ هزر وزمانی هۆپیدا کردوویەتی.[31]
زمانی ناونجیی ستاندەری ئەورووپی لە سێ شوێنی بنجییەوە لە زمانی هۆپی دوور دەکەوێتەوە، ئەم بەیەکتر نەبوون ولێك نەچوونە، یان دەگەرێتەوە بۆ جیاوازیی رێزمانی یان بۆئەو جیاوازییانەی کە لە تێگەیشتنی کاتەوە بەدی دێن. ئەم جیاوازییە مەزنە زمانییانە لەم خاڵانەی خوارەوەدا  دەبینرێن: (١) کۆ و ژمارە.(٢) ناوی چەندییە فیزیکییەکان. (٣) قۆناغەکانی سووڕان [32]. (٤) سیمای کاتی کارەکان، (٥) ماوە(مدت)، چڕی (شدت) و هەڵوێست (تمایل). جێی خۆیەتی کە باسی هەرکام لەم جیاوازییانە بکرێ.

١/ زمانی ناونجیی ستاندەری ئەوروپی ژمارەی کۆ[33] وژمارەی بنجی[34] نەتەنیا بۆ کۆمەڵە[35]ی واقیعی بەکاردەبات کە وێکڕا خراونەتەروو، بەڵکوو بۆ ئەو کۆمەڵانەش بەکاری دەبات کە وۆرف بە «خەیاڵی» ناو دەبردن؛ وەك *دەرۆژ* کە ناکرێ لە یەك تێگەیشتن (ادراك)ەوە بەدەست بێت. هۆپی کۆ لەم دۆخەیاندا بە کارناهێنێ و لەو شوێنەدا کە ئێمە *دە رۆژ* بە کۆمەڵەیەك دەزانین، دەڵێ: *«تا رۆژی یانزدەیەم »* یا *« پاش رۆژی دەیەم»*. بۆچونێکیش هەیە کە پێی وایە ئەم جیاوازییە لە نێوان شێوازی ئاخاوتنی زمانی ناوەنجیی ستاندەری ئەورووپی لەگەڵ زمانی هۆپیدا رەت بکاتەوە و تەنیا بە جیاوازییەکی ببەستی لە ئیدیۆمەوە بۆ ژێرخانی هزر هیچ گرنگ نییە. ئەگەر بەها پێدان و پێشخستنی «دەرۆژ» بەسەر «پاش رۆژی دەیەم» بەتەنیایی تاوتوێ کرابایە، بێ گومان روونکردنەوەی شیاو هەرئەوە بوو کە گوترا. بەڵام جیاوازیی لە نموونەی هزردا لەوجۆرەی کە وۆرف دەیهەوێ



پیشانی بدات، ناتوانێ پشت بە تاکە نموونەیەکی بەکارهێنانی زمانی ببەستێ، هەرچەندەش ئەو نموونە زمانییە بەرچاویش بێت. تەنیا زۆری نموونەکانە دەتوانێ ئەم ئەگەرە داشکێنێ کە ئێمە لەگەڵ جیاوازییەکی هەڵکەوتیانەدا رووبەرووین لە شێوەی ئاخاوتندا؛ و بەپێچەوانەوە، جۆراوجۆری نموونەکان ئەگەر(احتمال)ی ئەوە پتر دەکات کە لێرەدا جیاوازی لەشێوەی بیرکردنەوەدا لە ئارادایە، کەواتە ئیعتباری گشت ئەوبەڵگانەی کە وۆرف دەیانخاتەروو، گرنگە نەك تەنیا نموونەیەك لەوانە.

٢/ وۆرف لە زمانی ناونجیی ئەورووپیدا دوو جۆر ناو لە یەکترجیا دەکاتەوە.

ناوی تاك (فرد)[37] [یاناوی شیاوی ژماردن] کە ئاماژە بەشتی سنوردار دەکات (وەك: یەك دار ،یەك داردەست ،یەك  پیاو) و ناوی گشتی[38] [یاناوێك کە نەژمێرردرێ] « ئاماژە بە بەردەوامییەکی گونجاو دەکەن، (پیوستار همگون ) بێ ئەوەی سنوورەکەی دیار بێت (وۆرف ،ل ١٤٠)، وەك *ئاو، دار، گۆشت*).»

هەرکات بیانەوێ سنوورەکانی ناوێکی گشتی دیاری بکەن، بەم جۆرە دەستەواژانە دەریدەبڕن: (*جامێکی شوشە، قالبێك سابوون، پەرداخێك قاوە، / تەلیسێك ئارد*).

وۆرف دەڵێ: ئەم جۆرە دەستەواژانە کەتێیاندا وشەیەك بۆ زەرف لەگەڵ وشەیەك بۆ مەزروف لێکدراوە، رێگەیان بۆ ئەم چەمکە فەلسەفییە لەبارەی جیهانەوە خۆش کرد کە جیهان لێکدراوێکە لە سیما(فۆرم) و مادە. وۆرف

پێی وایە کە تیۆرییەکی ئاوا بۆ هەستی هاوبەشیی بێ راوەستان وەردەگیرێ: *کەواتە باوەڕهێنان بە سیما و مادە لە رێی عادەتە زمانییەکانەوە مسۆگەر دەبێ.* نموونە زمانییەکانمان زۆرجار داوامان لێدەکەن شتێکی ماددی بەلێکدانی دوو وشە ناوبنێین کەشتەکە بە دانەیەکی بێ سیما[ = ناوەرۆك، مادە ] و فۆرم، دابەش بکات. (وۆرف، ص ١٤١ ).

بە پێچەوانەوە لە زمانی هۆپیدا ناوەکان بەردەوام واتایەکی تاکە کەسییان هەیە؛ تەنانەت ئەگەر سنووری هێندێ لە شتەکانیش لێڵ و نادیار بێت. لە نێوان ناوە تاك و ناوە گشتییەکاندا لە بەرامبەریەکدا راوەستان لە ئارادا نییە؛ هەربۆیە هیچ ئاماژەیەك بە زەرف یا جۆرە قالبێك ناکرێ، و هیچ نموونەیەکیش لە ئارادا نییە کە دابەش کردنی جیهان بەشێوەی سیما و مادە کۆبکاتەوە.

٣/ لە زمانی ناونجیی ستاندەری ئەورووپیدا هێندێ زاراوەی وەك «هاوین»، « زستان» «بەیانی» و «ساعەت»، قۆناغەکانی سووڕان( phases of cycles) پیشان دەدەن، بەلاّم ئەوانیش وەك ناوەکانی دیکە سەیر دەکرێن. دەکرێ ئەوانە وەك بابەت یان شتی رێزمانی بەکاربێن و دەشکرێ کۆبکرێنەوەو وەك بەرژمارەی ژمارە (معدود عدد)بەهەمان شێوە بەکاربرێن کە ناوی شتە فیزیکییەکان بەکاردەبرێن. بەلاّم زمانی هۆپی لەم رووەوە جیاوازە. ئەو زاراوانەی کە ئاماژە بە قۆناغی سووڕان دەکەن لە رووی زمانییەوە لە ناوەکانی دیکە جیان و دەستەیەك بە سیمای جیاوازەوە پێکدێنن کە بە *زەمەنییەکان* ناودەبرێن.



وۆرف دەڵێ:

*هەستی بەردەوامی زەینی[یا زەمەن]،نابێتە شت(شئ)،واتە«وەك ناوچەیەك، پانتایەك یان چەندێتی (کمیت)یەك دەرنابڕدرێ. لەبارەی زەمەنەوە شتێك نانوێندرێ جیا لە «دواکەوتن(تأخر) ێکی بەردەوام». کەواتە لە زمانی هۆپیدا بۆ دانەیەکی بێ سیما کە وەلاّمدەری «زەمەن» بێت، بنەمایەکی نییە، بەو واتایەی کەوا لە زمانە ئەورووپییەکاندا هەیە. (وۆرف، ص١٤٣)*

٤/ سیستمی کاتی رێزمانی ئێمە، کات بەسێ بەش دابەش دەکات: رابردوو، ئێستا، داهاتوو؛ و بەم شێوەیە یاریدەی بە شت (شئ) بوونی کات دەکات، بۆ ئەوەی وەك قەزا تێی بگەین. لەم شێوەیەدا چەند گرفتێك لە ئارادا هەیە کە بەرچاوترینییان کاتی ئێستای رێزمانییە کە بەشێوەی جۆراوجۆر بەکاردێت. وۆرف پێی وایە کە ئەم نموونانە هزر دەشیوێنن.

فرمانەکانی زمانی هۆپی، کاتی رێزمانییان نییە، بەڵکوو تەنیا سیمای ئیعتبارییان[٣٩] هەیە وئەو سیمایانەشیان هەیە کە ئەسپێکت[٤٠] ومۆدالّەکان[٤١] پیشان دەدەن. سیما مۆدالّییەکان، دەستەواژەکان پێکەوە دەلکێنن. سێ سیمای ئیعتباری هەیە، یەکەمیان بەسانایی دەریدەخا کە ئاخێوەر رووداوێك رادەگەیەنێ کە لە رابردوو یان ئێستادا رووی داوە. دوویەمیان چاوەروانیی وداوای ئاخێوەر دەگەیەنێ وسێیەمیان دەریدەخا ئاخێوەر باسێك دێنێتە ئاراوە کە بەراستی زانیوە. سیما ئەسپێکتییەکان پلە جۆراوجۆرەکانی بەردەوامی لە بواری رووداوەوە رادەگەیەنن؛ و سیما مۆدالییەکان تەنیا کاتێك بەکاردێن کە باسێك دوو کار یان دو رستەی

بەند(تبعی) بگرێتەوە. ئەم سیمایانە، پێوەندییەکانی نێوان دوو رستەی بەند(بۆنموونە پێوەندییەکانی کات) پیشان دەدەن. بە باوەڕی وۆرف ئەم رۆنانە رێزمانییە خۆ لە بەشت بوونی کات دەپارێزێ.

٥/ زمانی ناونجیی ستاندەری ئەورووپی، *ماوە، چڕی و* ئاڕاستە لە رێگەی خواستنی کەشییەوە (استعارەی فضایی) وە دەردەبڕێ. بەم شێوەیە:

ئێمە ماوە بە [وشەی] *درێژ، کورت، زۆر، خێرا، کاوەخۆ* و... دەردەبڕین.چڕی بە[وشەی]، *زیاد، مەزن، گەلێ، قورس، سووک، سەرێ، خوارێ، تیژ، لاواز"* وئاراستە وهەڵوێستیش بە [وشەکانی] *پتر، زیاتر، هەڵدان، گەڕانەوە، نزیک بوونەوە، لەناوچوون، دەرکەوتن، پەیدا بوون، وەستان، هەڵکێشان، چوونە خوارێ، بەنەرمی، یەکدەست، خێرا، هێواش* ولەم جۆرانە وەسف دەکەین. واتە لەرێگەی لیستەیەکی بێ کوتایی لە ئیستیعارەکانەوە کە کەمتر دەکرێ بە ئیستیعارەیان بناسین؛ دەریان دەبڕین، چونکە تەنیا ئامرازی زمانییە کە دەستمان پێی رادەگات. زاراوەی نائیستیعاری لەم بوارەدا وەك، *پێش، دوا، زوو، بەردەوام، بەچڕی، زۆر، زاڵ* و... تەنیا بەرادەی پەنجەکانی دەستن وپێویستییەکان دابین ناکەن. (وۆرف ١٤٥)

بەپێچەوانەوە، زمانی هۆپی ئەم ئیستیعارانەی نییەو، ماوە، چڕی و ئاڕاستە بێژبەبێژ (تحت الفظی) دەردەبڕێ. بە بێ ئەوەی نیشانەیەك لەو سیما کەشیانەی تێدا بێت کە لە زمـــانی ناوەنجی ستاندەری ئەورووپیدا هەن، تەنانەت دەستەیەکی تایبەتی زاراوەکان بە ناوی تانسۆر[٤٢] ەکان هەن کە زۆر



بەربلاون و بەشێکی جیاوازی ئاخێوەریی پێکدێنن وئەو دۆخانەی سەرەوە [واتە؛ ماوە، چڕی وهەڵوێست]دەردەبڕن. بۆدەربڕینی ئەم دۆخانەش، شێوە زمانییەکانی تریش بەکاردێن. وۆرف کاریگەریی ئەم جیاوازییە زمانییانە لە سەر هزر لەم باسەدا کورت دەکاتەوە کە ئاخێوەرانی زمانە ئەورووپییەکان پتر حەزیان لەمەیە کەجیهان بەشێوەی شتەکان ببینن. ئەم شتانەش بۆ خۆیان لەمادەیەکی بێ شێوە (شکل) دروست بوون کە سیمایەکی دیاریان وەرگرتووە. یەکەی ناکەشی (غیر فضایی) بەشێوەی ئیستیعارەی کەشییانەدرك پێدەکرێن، بەلاَم بە پێچەوانەوە زمانی هۆپی واپێدچی کە: واقعییەت پتر لە چوارچێوەی زاراوەکانی رووداو یان باشترە بڵێین «رووداوان[٤٣]»دا شی دەکاتەوە؛ و ئەم کارەش بە دووشێوەی *بابەتییانە وزەینییانە* ئەنجام دەدا. بەشێوەی بابەتییانە: *تەنیا بەومەرجەی کە ئەزموونی فیزیکی، شیاوی تێگەیشتن بێت، رووداوەکان زۆرتر وەك هێڵی گشتی، رەنگەکان، جووڵەکان و جۆرەکانی دیکەی راگەیاندنی شیاوی تێگەیشتن دەردەبڕدرێن.* بە شێوەی زەینییانە: *ئەو دەستەیە لە رووداوە فیزیکی یان رووداوە نافیزیکییەکانیش بە دەرکەوتە (تجلی)ی هۆی نادیار دەناسرێن؛ وچەسپان ومانەوە یا دەربازبوون وهەڵوێستەکانیشیان بەهەمان هۆی نادیارەوە بەندن.* ئاکامی ئەم بارودۆخە ئەمە دەبێت کە بوونەوەرەکان هەموو بەیەك شێوە« دواتر ودواتر نەبن »؛ {بە دوای یەکتردا نەیەن} بەڵکوو هێندێکیان وەك گیاوگژ هەڵدەدەن، هێندێکی تریان بلاودەبنەوە وهێندێکیشیان دەتوێنەوە، هێندێك خەریکن دەپووکێنەوە، هێندێ لە بوونەوەران بەیەك شێوە دەمێننەوە تاکوو هێزە تێکدەرەکان لەناویان دەبەن. لەسروشتدا هەر

بوونەوەرێك کەبتوانێ وەك گشتێکی دەست نیشانکراو دەرکەوێ، هێزێکە لە جۆری بەردەوامی، هەڵدان، هەرەس هێنان، چەسپان، دەورلێدان یان توانستی داهێنەرانەی ئەو بوونەوەرە.(وۆرف ص ١٤٧)

« دۆرۆتی لیی »ش لە نێوان ئەو شێوە رێزمانی و شێوە هزریانەی کە لە ناو گەلی *وینتوویی*دا زاڵن، پێوندییەکی لەوجۆرەی بینیوە[٤٤]. هەر کارێکی زمانی وینتوو دوو شێوەی هەیە کە پێکەوە لە پێوەندیدان و بەپێی بارودۆخ بەکاردێن. *لەمەقولەی یەکەمدا رەگەکان لە نێوان دانەکانی دیکەی زماندا دەریدەخەن کە باس [بکەر]وەك کارایەکی سەربەخۆ لە چالاکییەکدا بەشدارە کە بەهۆی کارەوە وەسف دەکرێ و لە بەرامبەریشدا:*

*پاشگرێك بەرەگی مەقوولەی دووهەمەوە بەندە کە پێدەچێ واتا بنجییەکەی پێویستییەکی سروشتی بێت و لەگەڵ پاشگرەکانی دیکەی شێوەی مەقوولەی یەکەمدا بەرانبەر(متناظر)راوەستێ. ئەم پاشگرە بۆ یەکجێ پیشاندانی تەواوی ئەم دیاردانەی خوارەوە بەکاردەبرێ: ئەو دنیا (ئاخرەت)، هوبەندیی (علیت)، توانامەندی (بالقوە بوون)، ئەگەر(ئیحتمال)، پێویستیی (زەروورەت) وگەڕانەوە (رجوع) بۆداهاتوویەکی حاشا هەڵنەگر کە دەبێ ببێت ودەشتوانێ ببێت وتاك لە بەرامبەریدا داماو وکڵۆڵە. مەرجەعی مەقوولەی دووەم دۆخێك لە هەبوون (وجوود)ە کەتاك تێیدا کارایەکی سەربەست نییە.[٤٥]*

جیاوازی لە مەقوولەکانی کار لەو رووەوە گرنگە کە رەنگدانەوەیەکە لە تێگەیشتنێکی زاڵ لە جیهان. وینتوویی پێی وایە تەنیا دەتوانێ بەشێك لە ژینگەی خۆی بگرێتە دەست ،بەلاّم بەشەکانی دیکەی ژینگە بەتەواوی لە



دەسەلاّتی ئەو بەدەرن. ئەم میتافیزیکە ژێرخانیە دەکرێ بەمجۆرە کورت بکرێتەوە:

*وینتوویی هەرێمێکی بچووکی هەیە کە دەتوانێ تێیدا کاروبارەکان هەڵبژێرێ وبەرێوەیان ببات، هەست پێبکات، بیربکاتەوە وبڕیار بدات لەنێوان ئەم جیهانە ودەرروبەرەکەیدا، جیهانی زەروورەتی سروشتی لە ئارادایە کە لەوێدا هەموو ئەو شتانە، ئەگەریان هەیە هەبن یا توانستی بوونیان تێداهەیە، حەشاهەڵنەگریشن. لەوێدا بوون شیاوی ناسین ودەربڕین نییە.[٤٦]*

لێرەدا دیسانەوە لە بیرکردنەوە لەبارەی جیهان، لە نێوان هەراوترین لایەنەکان و مەقوولە سەرەکییەکانی رێزماندا جۆرێك تەریبیێتی بەدی دەکرێ. ئەو لایەنە رێزمانییەی کە لە توێژینەوەکەی لیدا جەختی لە سەر کراوەتەوە، لەگەڵ ئەو لایەنە رێزمانییانەی لە توێژینەوەکەی وۆرفدا دەوری سەرەکی دەبینین جیاوازە، بەلاّم ئەنجامە سەرەکییەکانی *وۆرف* و لی یەکن.

بەرلەوەی باسی پێوەندیی نێوان زمان وهزر کۆتایی پێبێنین، لەوانەیە واباش بێت ئەوەی ویستوومانە بیسەلمێنین یان ئەوەی نەمانویستووە بیسەلمێننین، پێیدا بچینەوە. ئێمە لە بەستراوەیی وپێوەندیی هۆیی نێوان زمان لە لایەك و هزرشیمان لە لایەکی دیکەوە کۆڵیوەتەوە. ئێمە گوتوومانە وشەکان و مۆرفۆلۆژی (گەردانکردن) بەرلە هەمووشت، لەسەرتێگەیشتن (ئیدراك) کاریگەرییان هەیە و گوتووشمانە کە شێوەی لێکدانی رستەکان لە سەرهزر، وبەرلە هەمووان لە سەرتوێژە ئینتیزاعیترەکەی هزر کاریگەرە، لە هیچککامیاندا نەمانگوتووە و نەمانویستووە بڵێین زمان تاقانە هۆی کاریگەرە، یان تەنانەت یەکەمین هۆی کاریگەرە لەسەر هزر. لە هیچ

یەکێکدا نەمانگوتووە کە پێوەندیی هۆیی بەپێچەوانەش کار ناکات، چونکە خەسلەتی بەردەوامی زمان وئەم راستییەش کە گەل لە رەوتی زەمەندا دەگۆڕێ، ئەمە بەتەواوی پێشبنیکراو دەکات کە بارودۆخی ژینگە، رێکخراوەی کۆمەلأیەتی وشێوە باوەکانی هزر، زمان لە واتا بەربلأوەکەیدا دەگۆڕن. بەلأم ئەمەش ناتوانێ پێش بگرێ لە کاریگەریی زمان لەسەر گەشە کردنی بیری تاك، و هەموو ئەو شتەی جەختی لەسەردەکەینەوە ئەمەیە. سەرەرای ئەمەش نالێین لێکۆلێنەوەی زمانێك، لە خۆیدا بەسە بۆ ئەوەی خەسلەتی گشتیی ئاخێوەرانی ئەو زمانە پیشان بدات. زانیارییەکی گشتی لەسەر کولتووری ئاخێوەرانی ئەو زمانە تاڕادیەك پێویستە؛ و لەراستیدا دەبێ لەوە بەگومان بین کە لە رێگەی تاوتوێکردنێ زمانێکەوە بکرێ خەسلەتە سەرەکییەکانی هزری ئەو گەلە بەدەست بێن، بەبێ ئەوەی زانیارییەکی بەربلأومان لە کولتووری ئەو گەلە هەبێت.

سەرەنجام بەلگەمان نەهێناوەتەوە بۆ ئەوەی کەزمان گاریگەرییەکی داسەپاوانەی لەسەر هزر هەیە، واتە ئەوەکە زمان تەنیا چەند شێوەیەکی دیاریکراوی تێگەیشتن (ئیدراك) دەرخسێنێ وشێوەی دەربڕین رێکدەخا وپێش بەئەگەری هاتنە ئارای ئەوانی دیکە دەگرێ. چونکە بەشێوەی ئاسایی تێگەیشتن و رێکخستنی ئەزموون لەرێگەی زمانەوە بەدی دێت ،ئەمە پێچەوانەکەشی راستە. ئەوتوخمانەی لەزمانە سروشتییەکاندا تاوتوێمان کردوون؛ وەك وشەکان، مۆرفۆلۆژی وشێوەکانی رۆنانی رستە ،بارودۆخەکە بۆ دەربڕینی هێندێ بابەت نامومکین ناکەن، بەلکوو تەنیا دۆخی دەربڕینەکەیان دژوارتر دەکەن. لەزمانە دەسکردەکاندا، واتە ئەوجۆرە زمانەی مەنتیقزان



کاری پێیەتی ولەبەشی چوارەمدا دەخرێتە بەرباس، وشەکان چەسپاو و نەگۆڕن. یاسای لێکدانی رەمزەکان ئاشکران وشێوازی لێکدانی گونجاو دەست نیشان کراوە. لەم جۆرە زمانە نموونەییانەدا، زۆرجار دەکرێ پیشان بدرێ کەناکرێ دەستەواژەیەکی پێشکەشکراو بەزمانی سروشتی دەربڕدرێ. بەلأم لە زمانە سروشتییەکاندا دۆخەکە لەگەلٚ زمانە نموونەییەکان جیاوازە. وشەکان بۆیان هەیە بەزیادکردنی وشەی نوێ یان پەرەسەندنی مەجازییانەی وشە کۆنەکان گەشە بکەن. هێندێ جار، کەسەکان یاسا رێزمانییەکان رەچاوناکەن، زەبر ناکەوێ لە تێگەیشتن لە باسەکەش. دیسانەوە بە ئەستەم دەکرێ پیشان بدرێ کە باسێکی پێشکەش کراو ناکرێ لە چوار چێوەی زمانی سروشتیدا دەربڕدرێ. لانی کەم لەم باسەی ئێستای ئێمەدا ئەمە پێویست نەبووە [کە پیشان بدرێ] باسی شیاوی دەرنەبڕینی ئاوا لە ئارادا هەبن. مەبەستی سەرەکیی ئێمە ئەمەیەکە بلێین تاقمێ لەتایبەتییەزمانییەکان، هێندێ لە شێوەکانی تێگەیشتن زالتر یان چاوەروانکراوتر دەکەن، بەلأم ئەمە بەم واتایە نییە کە ئەو تایبەتمەندی و خەسلەتە زمانییانە، شێوەکانی دیکەی تێگەیشتن نامومکین دەکەن. بەشێوەیەکی وەکوو ئەوانەی، لەپیشاندانی ئەنجامە میتافیزییەکانی زماندا هەبوون، مەبەستی ئێمە ئەوە نەبووە کە لە زمانێکدا دەربیبخەین، بۆچوونە دژەکان شیاوی دەربڕین نین. جیالەمەش، لەحالێکدا کە وۆرف بەلگەی بۆئەمە دەهێناوە کە میتافیزیکی زالٚ لە زمانی هۆپیدا لەگەلٚ ئەو میتافیزیکەی لە جەرگەی زمانە ئەورووپییەکاندا هەیە جیاوازە، راپۆرتەکەی خۆی لەسەر فەلسەفەی زمانی هوپی بە زمانی ئینگلیزی نووسیوە. *بێرگسۆن* کە هزرەکەی لە ئاوڕدانەوەی بۆ رابردوو[٤٧]دا، لە شێوەی

بیرکردنەوەی جۆری هوپی نزیکترە تا ئەورووپییەکە، لە دەربڕینی هزری خۆی بەزمانی فەڕانسی زۆر سەرکەوتووتر بووە.

با لە کەوانەدا ئەمەش بڵێین کە پیشاندانی پێوەندیی نێوان فۆرمە زمانییەکان و میتافیزیك بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ هەقیقەتی سیستمە [هزری]یە نەیارەکاندا لە پێوەندیدا نییە. ئەگەر هزری *ئەرەستو* لە هزری *بێرگسۆن* بەرێژەی میتافیزیکی شاراوەی زمانی ناوەنجی ستاندەری ئەورووپی نزیکترە، ناگەینە ئەو ئاکامەی کە هزری *ئەرەستو* لە هزری *بێرگسۆن* دروست تر یان نادروست ترە.

ئەو حەقیقەتەی کە هەر ئێستا بینیمان، واتە ئەوەی کە هزری میتافیزیکی لەوانەیە لە جیهەتێکی دژ بە میتافیزیکی جۆری ئەو زمانە بێت کە پێی نووسراوەتەوە؛ زۆرباشتر دەریدەخات کە هزری میتافیزیکی ناتوانێ لە بواری زمانییەوە بە تەواوی مەرجدار بێت.

کەواتە مەبەستی ئەم بەشە ئەوە بووکە دەریبخات زمان یەکێکە لەو هۆیانەی کە لە سەرتێگەیشتن و ڕێکخستنی گشتی ئەزموون کاریگەریی هەیە. بەلاَم مەرج نییە کە کـاریگەریی زمان بخرێتە پێش کاریگەریی هۆیەکانی تر یان تاکە هۆی کاریگەریی بێت، یا ئەوەیکە کاریگەرییەکەی ئیلزامی بێت؛ بەلاَم ناکرێ کـاریگەریی زمان لە سەر هزر پشت گوێ بخرێ.



## (٤)

باسی پێوەندیی نێوان زمان و کولتورلانیکەم ئەم ئیمتیازەی هەیە کە ئەم بابەتە بە ڕێژەی باسەکەی پێشتر، بابەتیانە ترە، لێدوان لە بارەی پێوەندیی زمان و هزر، لەبەشەکەی پێشوودا دژواربوو؛ چونکە دەست نیشانکردنی هزر، وەك لایەکی تری بەراوردکردنەکە ئەستەم بوو. لە باسی کاریگەریی توخمە زمانییە جۆراوجۆرەکان لەسەر تێگەیشتندا، بەڵگەکان ناراستەوخۆ بوون و ئەوەیان دەگەیاند کە بەپێی ئەو زانیارییانەی لەبارەی کۆمەڵەی زەینییەوە هەمانە، پێدەچێ ئەم توخمانەش چەند کۆمەڵەیەکی ئاوا پێکبێنن کە لەسەر تێگەیشتن کاریگەرییان هەبێ. تەنیا ڕێگەچارەیەکی دیکەی کە هەیە ئەمەیەکە تەکنیکی دەرهاویشتن*بەکار بێنین بۆ ئەوەی ئەم بابەتە تاقی بکاتەوە کە ئاخۆ ئاخێوەرانی زمانە جۆراوجۆرەکان، وێنەی لێڵ بەشێوەی تەواو جیاواز تێدەگەن؟ تەنانەت لێرەشدا، تێگەیشتن مۆرك ونیشانی هاوکێشەی زمانەوانییانەی خۆی پێوەیە؛ و لەوانەشە پێویست بێت کە داوا لە بینەر بکەن ئەوەی دیتوویەتی دوای ماوەیەك بیخولقێنێتەوە، نەك دەریببڕێ وبیگێڕێتەوە. تەنانەت ئەگەر ئاخێوەرانی زمانە جۆراوجۆرەکان[وەك کوردی زمان، ئینگلیزی زمان یا چینی زمان] تارادیەك ئەنجامی جیاوازیش نیشان بدەن، دیسانەوەش مەسەلەکە بۆ ئەوەیە کە بیسەلمێنن ئەم جیاوازییە لەبەر زمانە نەك لەبەر ئەو کۆمەڵەیەی کە هۆیە ژینگەیەکانی دیکە دەری دەخەن. سەرەڕای سروشتی نەبڕاوەی ئەم جۆرە تاقیکارییانە، چونکە بەڕێوە بردنیان

زۆر دژواره، ئەم تاقیکارییانە ناتوانن وەك بەڵگەی باوەڕپێکراو و پتەو دابنرێن، ئەوبەڵگانەی لەوانەیە لە داهاتوویەکی نیزیك دا دەست بکەون.

لێدوان لەبارەی پێوەندیی نێوان زمان و لایەنە بەربڵاوترەکانی هزر بڕێك باشتربووە، چونکە لانی کەم، بەڵگەی راستە وخۆ لە بارەی پێوەندیی سیما رێزمانییەکان وخەسلەتی گشتی هزر وفەلسەفەی رۆژئاوا لە ئارادا هەبوو، هەرچەند لێرەدا دەکرێ سیما زمانییەکان بە دڵنیاییەکی رێژییانەوە وەسف بکرێن. بەڵام بەڵگەکان لەبارەی ئەو بۆچوونەی کە پێی وایە تیۆرە هزرییەکانی زاڵ لە فەلسەفەی رۆژئاوادا [کاریگەریی سیما زمانییەکانیان بە سەرەوەیە]، واتە بۆچوونێکی کە بە شێوەیەکی بەربڵاو وەرگیراوە و پەسندکراوە، تەنیا لێکدانەوە (تەفسیر)ی بەڵگەیەکی مێژووییە. هەروەها کاتێ کە وۆرف زمانی ناوەجیی ستاندەری ئەورووپی لەگەڵ شێوەکانی هزری هۆپیدا بەراورد دەکا، ئەنجامی بەراورد کردنەکەی بوو بە چەند لێکدانەوەیەك؛ وئەم لێکدانەوانەشی بە پێی هەستکردن لە بارەی کەشێکی کۆمەڵایەتییەوەیە، نەك بە پێی بڕیارێکی قەتعییانەی وەك بەڵگەیەکی نووسراو. ئەگەرچی لێکدانەوەکانی وۆرف، بەرهەمی توێژەرێکی ووردبینن و بەپێی ناسیاوییەکی درێژخایەن کە لەگەڵ گەلی هۆپیدا هەیبووە و بابەتی توێژینەوەکەشی بووە، دامەزراون بەڵگەی بەنرخی تێدایە، سەرەرای ئەمانەش، ئەم جۆرە بەڵگانە تایبەتمەندیی قۆناغی سەرەتایی زانستێکن نەك قۆناغە پێشکەوتووەکەی.

تاوتوێ کردنی پێوەندیی نێوان زمان و کولتوور وبەڵگەهێناوە بەشێوەیەکی وردتر لەم بوارەدا کارێکی ساناترە. هەڵبەت ئەمەش دەزانین کە لە هەرکارێکی زانستیدا لەبەر گشتاندنی کردە تایبەتەکان بە نموونەکان



وگشتاندنی نموونەکانیش بەبابەتی بەربڵاوترەوە، توخمی راڤەکردن دێتە ئاراوە؛ بەڵام لانیکەم بەرانبەر بەکردە تاکییەکان هێندێ لێکدانەوەی واهەن کە گشتین و دەسەلمێندرێن. هەرچەند ئەم شێوەیەی توێژینەوە گرفتی مەزنی لە بەردەم داهەیە و ئەو وردییەی تێدانییە کە لەوانەیە دواتر بە دەست بێت، بەڵام روانگەیەکی گشتی و هیوابەخشتری هەیە. دیسانەوە چونکە هزر لەگەڵ لایەنە گشتییەکانی کولتوردا لە پێوەندی دایە و کاریگەریی ئەوانی بەسەرەوەیە، هەربۆیە توێژینەوە لەبارەی پێوەندیی زمان و کولتووردا لە وانەیە کلیلی بەشی پێشووی مەسەلەکە بێت.

وەك بابەتەکەی پێشوو، وشەکان، گەردانکردن وپێکهاتەی لێکدانی رستەکان، وەك توخمە زمانییەکان، دەکرێ لەگەڵ نموونە کولتوورییەکاندا بەراورد بکرێن، لەسەرەوە دیتمان کە پێوەندییەکی نزیك لە نێوان وشەکان و ژینگەی [ئاخێوەراندا ]هەیە؛ وچونکە نموونەگشتییەکانی رەوشتمان بە پێناسەی کولتوور دانا وئەمانەش وەك وشەکان، ملکەچی ژینگەن، کەواتە پێدەچێ کە لەنێوان وشەکان و نموونەگشتییەکانی رەوشتدا پێکبەندییەك لەئارادا هەبێ. ئاشکرایە بۆ ئەو شت و کاروبارانەی تێکەڵ بە کرداری ئاسایی ئێمەن، پێویستیمان بە وشەکانە و بەپێچەوانەوە ئەو وشانەی کە لە قسەکردندا بەکارنایەن، بە هۆی ئەرکی زمانەوە ئەستەمە کە بۆماوەیەکی درێژخایەن لەیەکێ لە جۆرەکانی وشەدا، بەچالاکی بمێننەوە. ناکرێ حاشا لەمەش بکرێ کە زمان و کولتوور لەم رێگەیەوە پێکەوە دەبەسترێنەوە و لەسەر ئەم ئەنجامگیرییەش بەگشتی دمەتەقێیەك نایەتە ئاراوە. بەڵام ئەو ئەرکەی مۆرفۆلۆژیا وشێوەکانی لێکدانی وشەکان هەیانە دمەتەقییێ زیاتری

لە سەرە. لە باسی زمانی هۆپیدا کەهەردووکی ئەم خالانەی تێدایە، وۆرف پێی وایە کەجیاوازییەکانی نێوان یاسای زمانی ناوەنجیی ستاندەری ئەورووپی وریزمانی هوپی نەتەنیا بەرانبەرە لەگەڵ ئەو جیاوازییانەی لە شێوەی بیرکردنەوە داهەیە، بەڵکوو بەرانبەریشە لەگەڵ ئەوجیاوازییانەی لە کولتورەکانیشدا هەیە. ئەم جیـاوازییانە بە دەوری ئەو تێگەیشتنە جیـاوازانەوە کـۆبوونەتەوە کـە لەبارەی زەمەنەوە هەن.

دیتمان کە لە زمانی هۆپیدا رۆژەکان بە بەکارهێنانی ژمارەی سەرەکی کۆنابنەوە، بەڵکوو دەگەڕێنەوە بۆ ریزە پلیکانییەکان. *[بۆنموونە لە جیاتی ئەوەی بگوترێ دە رۆژ، دەگوترێ: پاش رۆژی دەیەم.]*وۆرف دەڵێ، گوایە وا خەیاڵ دەکرێ کە رۆژە جیاوازەکان، سەر لە نوێ دووپاتەبوونەوەی تاکەشتێکن؛ نەك چەند بڕگەیەکی بە تەواوی جیاواز هەڵاوێردراوی زەمەن. چونکە پێیان وایە کات ئەو بەردەوامییەی تێدایە، گرنگییەکی تایبەت دەدەن بەو کارەی لەیەك کاتدا دەیکەن؛ لە بەرئەوەی دەکرێ چاوەروانی بکرێ کە ئەم کارە، کاریگەریی خۆی لە سەر هاتنەوەی زەمەن هەبێ. تەدارەك و ئامادەکارییەکان، بەشێکی گرنگی ژیانی هۆپی پێکدێنن وئەوکارانەش دەگرنەوە کە وەك: رازونیاز، رێورەسم، هەقایەتوێژی وجادووگەری وتەنانەت خۆزگە باشەکانیش کە بۆ بەرێوەبردنی رێ ورەسمێك دەردەبڕدرێن، بەلاّم باسێك ناکرێ لەو ئامادەکارییانەی لەگەڵ زمانی ناوەنجیی ستاندەری ئەورووپیدا دەگونجێن، وۆرف دەڵێ:

چالاکی لەپێشدا ئامادەکراوی هوپی جارێکی تر ئاکامی هزری بەستراوە بەزمانەکەیانەوە پیشان دەداتەوە کە رەگی لە پێداگرییەکدایە کە لە سەر بەردەوامی و دووپاتە بوونەوەجەخت دەکاتەوە. روانینی شتیانە (شیئی) و



بەکەشی بوونی زەمەن (وەك روانینی خۆمان)، واتای گشت بەهای ساتە بێ ژمارەکان تاریك و لێڵ دەکات؛ بەلاّم ئەوشێوە بیرکردنەوەیەی کە بە ئاگایی زەینیی لە ماوە و رەوتی بێ پسانەوەی «دواتر(متأخر)بوون»ی رووداوەکانەوە نزیك بێت، ئاستی تێگەیشتن لە زەمەن بەرەوسەرتردەبات. (وۆرف، ص ١٥١ )

هەروەك بینیمان وۆرف لەسەر ئەو باوەڕیە کە ئەو جیاوازییانەی کە لە روانین لە بەرامبەر زەمەندا هەیە، ئەنجامی راستەوخۆی رۆنانی زمانەکانە.

روانینی چەندییانە (کمّی) وبەکەشی بوونی زەمەن لە زمانە ئەورووپییەکاندا لە دژایەتییەکی تەواودایە لەگەڵ روانینی [زمانی]هۆپی بەرانبەر بەزەمەن. وۆرف لە پێوەندی لەگەڵ ئەم روانینەدا، زاڵبوونی ئەم کاروبارانەی خوراەوەی [بەسەر کولتووری رۆژئاواییەوە ]دۆزیوەتەوە:

١/ یاداشت هەڵگرتن، تۆمارکردنی رووداوەکانی رۆژ، نوسینگەداری، ژمێریاری وئەو بیرکارییەی بۆ ژمێریاری داهێنراوە.

٢/ حەز لە ریزبەندیی کردنی ورد، رێکەوت دانان، رۆژ ژمێری، پێوەری کات، سەعات، مووچەی سەعاتی، سەقامگیریی زەمەنی وزەمەن بەوجۆرەی کە لە فیزیکدا بەکاردێت.

٣/ ساڵنامەکان، مێژوو، حەزی مێژوویی، حەزکردن لە رابردوو، شوێنەوارناسی و مەیلی بەدەروونی کردنی سەردەمەکانی رابردوو؛ بۆنموونە کلاسیزم و رۆمانتیزم. (وۆرف، ص ١٥٣ )

وۆرف حەز لە خێرایی ودەست پێوەگرتن و گێڕانەوەی کاتیش دەداتە پاڵ ئەم تیڕوانینە چەندییانەیە بەرانبەر بەزەمەن. کەواتە واپێدەچێ هێندێ لە جیاوازییەکانی نێوان کولتووری هۆپی وکولتووری ئەورووپی، لە چوارچێوەی

تێڕوانینی جیاوازیان بۆ زەمەندا شیاوی روونکردنەوە ودەربڕین بن؛ وئەم تێڕوانینە، هەروەك لە بەشی پێشوودا نیشانمان دا، پێوەندیی بە جیاوازییەکانی رۆنانی رێزمانی ئەو زمانەوە هەیە.

هۆیچێریش لە رەوتی کارکردنی لەگەڵ گەلی ناواهودا لە بارەی پێوەندی مەقوولە رێزمانییەکان بە کولتوورەوە بە ئەنجامێکی لەو شێوەیە گەیشت[٤٨] هۆیچێر، لە سەرەتادا، سیما(شکل)ی کاری زمانی ناواهویی تاوتوێ کرد ولە نێوان کار وباوەڕی زاڵ بەسەر کۆمەڵگە دا، جۆرە تەریب بوونێکی هەست پێکرد. ئەو کاری لەزمانی ناواهوییدا بەدوو دەستە دابەش کرد؛ کاری خەسیو (خنثی)وکاری چالاك. *کاری خەسیو بارودۆخەکان دەنوێننەوە وئەوەش نیشان دەدەن کە جووڵە یان کردەیەك لە ئارادانییە. هێندێك لەوانە چونێتیی (کیفیت)ەکان دەردەبڕین، وەك شین بوون، کز یان بەرزبوون.* لە لایەکی دیکەوە *کارە چالاکەکان، رووداو، کردە وجووڵانەکان دەردەبڕن.* هەرچەند لەیەکەمین روانیندا ئەم دوو دەستە کارە بە تەواوی لەیەکتر جیاوازن، بەلاَم هۆیچێر لە شیکاریی جۆرەکانی کاری خەسیودا، تێگەیشت کە هەرکام لەوانە جۆرێك تەرك کردنی جووڵان دەردەبڕن. ئەو ئەنجامە شیکارییەکەی خۆی بەم شێوەیەی خوارەوە کورت دەکاتەوە:

*.... پێدەچێ کە کارەکان لە زمانی ناواهودا بە شێوەیەکی بەربلاَو بە دەوری راگەیاندنی رووداو یان باشترە بڵێین « روودانەکان » ەوە خول دەخۆن. ئەم روودانانەن کە لە بەر تەرکی جووڵان لێیان، دەڵێی، بەستوویانە (منجمد)، و چالاکەکان، رووداني لە جووڵەدان...*



بەلاَم ئەمە، تەواوی باسەکە نییە. شیکردنەوەی وردی واتای کارە خەسیووچالاکەکانی زمانی ناواهویی، ئاشکرای دەکات کە روودانەکان نەك بەشێوەی رووت (انتزاعی) بەڵکوو پتر بە شێوەی بەرجەستە وماددی وێنا (تصور) دەکرێن؛ واتە لە چوارچێوەی گەڕانی ئەجسامی مادیدا یان لە چوار چێوەی کاروبارێکدا درك پێدەکرێن کە بەشێوەی مەجازی لەگەڵ جووڵانی شتەمادییەکاندا پێوەندییان هەیە. هەوڵ دەدرێ کە وردە کارییەکانی جووڵان خۆی رابگەیەنرێ، تەنانەت جووڵانی شتێك (جسم) یان دووشت یان چەند شت لە بواری واتا سازییەوە پۆلێن دەکرێن وهێندێ جار کارەکان لەنێوان جووڵەی شتەکان کە لە رووی شێوە ودابەشبوون لە کەش (فەزا)دا جیاوازن، جیاوازی دادەنێن [٤٩]

هۆیچێر باسەکە لە بوارەکانی دیکەی زمانی ناواهویشدا پەرەپێدەدات ولە وانەشدا جەختێکی هاوشێوە لە سەر جووڵان هەست پێدەکاتەوە و لەم رووەوە لە نێوان زمان وکولتووری ناواهوییدا جۆرە تەریب بوونێك دەبینێ ودەڵێ:

باسەکە کورت دەکەینەوە: لە سێ نموونەی هەراوی قسەکەریدا کە بەکاری چالاك پیشان دەدرێن، واتە لە راگەیاندنی کردە، رووداو و پێکهاتنی ناوی خۆرسك (ذات)دا، زمانی ناواهویی لەسەر جووڵە پێدادەگرێ و جۆر، روو(جیهەت) ودۆخی جووڵانێکی ئاوا بە درێژە باس دەکات. مەقوولەی [کار]ە خەسیوەکانیش بەم تێگەیشتنە لە جیهانی جووڵانەوە، پەیوەست دەبن. چونکە گوتراوە کە ناواهویی میعماری وەك مۆسیقای بەستوو (منجمد) وەسف کردووە.

کەواتە ناواهوییی وەستان بە ئەنجامی تەرکی جوولاّن پێناسە دەکات. لە هەر بوارێك لە کولتووری ناواهوییدا، ئەگەر وەك گشتێك دابنرێ، دەکرێ چەند لێکچوونێك لەگەڵ ئەم بابەتەدا ببیندرێ. گەلی ناواهو تەنانەت ئێستاش گەلێکی کۆچبەرە و بەدوای مێگەلەکانی خۆیەوە ئاقار بەئاقار دەڕوا. ئوستوورە و ئەفسانەکانیش ئەم بابەتە بە بەرجەستەترین شێوە دەنوێننەوە. چونکە هەم خوداکان و هەم قارەمانە کولتوورییەکانی، بێ وچان لە شوێنێکی پیرۆزەوە بۆ شوێنێکی پیرۆزی دیکە دەڕۆن و بەم کارەیان هەوڵ دەدەن ڕەوتی بزێوی، کە جیهانە، ئاوەدان و تەکمیل بکەن. (٥٠)

هۆیجێر لێکچوونێکی دیکەش لە نێوان زمان وکولتووری ناواهوویدا دەبینێ؛ ئەمجارەیان ئەم لێکچوونە لەگەڵ بوارێکی دیکەی ڕێزمان واتە لەگەڵ ڕۆنانی ڕستەدا لە پێوەندی دایە. ئەو تێدەگات کە ئەو ڕستە نموونەییەی کارا ـــ کردە، کە لە هەمووزمانە ئەورووپییەکاندا برەوی هەیە، لە زمانی ناواهوییدا نییە. کەسێك بەکردەیەکەوە پێوەندیی دەبێت، بەلاّم نەك بەوشێوەیەی کە کارا یان هۆی ئەو کردەیە بێت. جوولّە یان وەستان بە سروشتی شتەکان دەزانن، نەك بە کارتێکراوی کارایەك. هۆیجێر بەمە دەزانێ کە چۆن ئەم بابەتە لەگەڵ ڕەوشتی گشتی ناواهوییدا بەرانبەر بە سروشت، یەکانگیرە بەو جۆرەی کە *کلوکۆهان* و *لەیتۆن* ڕایانگەیاندووە.(٥١)

کلوکۆهان و لەیتۆن دەڵێن ناواهویی نایهەوێ دەست بەسەر سروشتدا بگرێ وباوەڕیشی بەکارێکی وانییە. بەڵکوو تەنیا دەیهەوێ بە خوێندنی دۆعا وبەڕێوەبردنی بۆنە و ڕێورەسم بیخاتە ژێر کاریگەریی خۆیەوە. هەر ئەم نەبوونی هەڵوێستە کردارییانەیە بەرانبەربە سروشت، کە لە کردەکانیشیدا



دەردەکەوێ، لە ڕۆنانی ڕێزمانەکەشیدا بەم جۆرە ڕەنگیداوەتەوە کە زمانی ناواهویی لە چوارچێوەی کردەدا لە سەریەك شت(جسم) قسە ناکات.

ئەگەرچی ئەو بەڵگانەی کە وۆرف وهۆیجێر پێشکەشی دەکەن ئێمە دەهەژێنن، بەلاّم پرسیار ئەمەیە کە ئاخۆ ئەم بەڵگانە بەوردی تاچ ڕادەیەك ئەو پێوەندییانەی ئاماژەیان پێکراوە نیشان دەدەن ؟ وۆرف لە بارەی بۆچوونەکەی خۆیەوە تارادەیەك خۆکەم بین بوو و پێیوابووکە: « لە نێوان ڕێسا کولتوورییەکان و نموونە زمانییەکاندا هێندێ پێوەندی هەیە، بەلاّم نەك پێکبەندی یان لێکچوونێکی دەست نیشان کراو. » (وۆرف ،ص ١٥٩)" بەلاّم هویجێر دەخوازێ لە وۆرف توندتر بڕوا و پێی وایە کە وۆرف بەڵگەکانی کەمتر لەوەی کەهەن لە قەڵەم داوە، دەکرێ لەبارەی لێکچوونی کولتوور وزمانەوە، داوای زیاتر بکرێ. هەوڵدان لە پێناو سەقامگیرکردنی ئەم جۆرە لێکچوونانە، بێ شك دەکەوێتە بەرنامەی توێژینەوەکانی داهاتووەوە. بەلاّم ئێستا ناگونجێ کە لەم بارەیەوە، وەك میتۆدێکی گشتی، زیاتر داوا بکرێ. هەروەك بینیمان هویجێر، لەنێوان جوولاّن کە لە چوارچێوەی فرمان زمانی ناواهوییدا دەردەبڕدرێ ولە جولاّنەوەی گشتیی گەلی ناواهودا، تەریبییەکی سەرسوڕهێنەر دەبینێ. بەلاّم جێی گومانە کە تەنانەت کەسێك وەسوەسە بێت ئەم نموونەیە بگشتێنێ وچاوەڕوانیشی هەبێ کە لە هەموو جێیەکدا ئەم لێکچوونە بدۆزرێتەوە. بەر لەوەی ڕێگە بدرێ گشتاندنێکی ئاوا بکرێ، پێویستە چەند توێژینەوەیەکی دیکەی وەك توێژینەوەکەی هۆیجێر بکرێ و بەزمانی جۆراوجۆریش بلاّو بکرێتەوە. ئەم خاڵە شایانی سەرنجدانە کە وۆرف لە توێژینەوەکەیدا کە لە بارەی « کار» لە زمانی هۆپییەوە کردوویەتی،

ئەوپێگەزاڵەی هویجێر بەکاری دەبەخشێ، ئەو پێی نابەخشێ. پێدەچێ گرنگییەکە لە مەدا بێت کە لەوانەیە هەر کولتوورێك لەگەڵ هێندێ بوار زمانیی سەربەخۆیدا، چەند لێکچوونێکیان لە نێواندا هەبێ. بەڵام بەڵگەی تەواومان لەبەر دەستدا نییە کە ئەم بوارانە (بەبێ ئەوەی نموونەیەکی تایبەت بەوردی تاوتوێ بکرێ ) دیاربن. هەنوکە پێویستە کە هەم زمان و هەم کولتوور تاوتوێ بکرێن تاکوو لایەنە تەریبەکانی نێوانیان دەربکەوێ. هەربۆیە دەست نیشان کردنی خاڵە لێکچووە دەرخراوەکانی نێوان زمان و کولتوور ناتوانن دەست نیشانکردنێکی زانستییانە بن. تەنیا پاش توێژینەوەی زۆرتری لەم جۆرە، لەوانەیە دەرببڕدرێ یان تەنانەت دەردەبڕدرێ کە چ تایبەتمەندییەکی رێزمان، بەگشتی، دەکرێ لە پێوەندی لەگەڵ کولتووردا لێکچوونیان چاوەڕوان بکرێ، هەڵبەت راگەیاندنی ئەم باسە بەم واتایە نییە کەئێمە ئەوتوێژینەوانەی کراون مەحکووم دەکەین؛ بەڵکوو مەبەستی ئێمە بیرخستنەوەی ئەم بابەتەیە کە توێژینەوەکان سەرەتای خوێندنەوەیەکی بەربلاوترن. بەرلەوەی بکرێ گریمانەی تایبەت لەم بارەیەوە فۆرمۆل بەندی بکرێ، دەبێ زانیاریی پتر کۆبکرێتەوە. بەڵام هەر زانستێکی نوێ لە سەرەتای سەرهەڵدانییەوە لە بارودۆخێکی ئاوادا بووە.



## پەراوێزو سەرچاوەکان

* دەرهاویشتن (فرافکنی): تەکنیکێکی دەروونناسییە، بە واتای کردەی واقیعیانەی وێنا کردن (تصور)ی بابەتێکی زەینییە و هەروەها هزر و بیرۆکە و بۆچوونی خۆ دانە پاڵ کەسانی دیکەیە، و بەتایبەت بە مەبەستی لۆمەکردن وئیدانە کردنیان بەکار دێت. [وەرگێڕ]

1. Edward Sapir “ conceptual categories of primitive language ” science No.74 (1931) p. 578

٢. بەتایبەت لەم وتارانەدا:

Science and linguistics ,“Technology Review , 42 (1939 – 40): 229ff ; “Linguistics as an exact Science”*ibid* ,43(1940 – 41);61ff ; “Languages and Logic ”,*ibid* ,43 (1940 – 41) ; 250ff ; “The Relation of Hobitual Thought and Behavior to Language ” in language culture and personality: Essays in Memory of Edward Sapir ed.by Leslie Sapir , A. Irving Hallowell , and Stanley S. Newman (Menasha, Wis,1941),pp. 75ff.

ئەم چوار وتارە بەناونیشانی: چواروتار لەبارەی دەرەوەی زمان چاپ کراون.

Four Articles on Metalinguistics (Washington , D.C.; Foreign service Institute , Department of state 1949).

وهەروەها لەبارەی زمان، هزروواقعییەت: هەڵبژاردیەك لە نووسراوەکانی بنیامین لی وۆرف (پێداچوونەوەی جۆن. بی، کارۆل)دا هاتووە:

Language, Thought and Reality: selected writings of Benjamin Lee Whorf ,ed. John B. Carroll (Cambridge , Mass: Mass Institute of Technology , 1956)

لەم وتارەدا لەمەودوا بەناوی کارۆل ئاماژە بەم بەرهەمەی سەرەوە دەکەین.

3. Hopi
4. Standard Average European Language.
5. Shawnee.
6. “ Gestalt Techniques of stem composition in Shawnee”, Appedix to “ Shawnee stems and The Jacob p. Dunn Miami Dictionary ”, in prehistoric Research series (Indiana Historical society , 1940) 1 no.9: p.395 Carroll p. 169
7. Clyde Kluckhohn and William H. Kelly , “ The concept of culture ”, The science of Man in The world Crises, ed.By Ralph Linton (Now York 1945) ,p.97





8. Themes.
9. Opler.
10. M. E.Opler , “ An Application of the Theory of Themes in culture ”. Journal of The Washington Academy of Sciences , 36 (1946), 134 ff
11. Aztec
12. Benjamin L.Whorf , “ Science and linguistics ” , Technology Review 42 (1939 – 40) ,p.6. Carroll.,p.216
13. Edward sapir , “ language and Environment ”, American Anthropologist , ns 14 (1912). p 228. Reprinted in selected writings of Edward sapir,ed. by D. Mandelbaum(Berkeley , Calif. 1949). pp. 90 -91
14. Nootka.
15. Paiute
16. Mental
17. Bruner
18. Goodman
19. Bird

٢٠. لەکاتی چاولێکردن لە فیلم پێمان وایە کە ئەوەی دەیبینین، دەڕوا. کاتێك لە ئوتۆمبێلدا دانیشتووین پێمان وایە کە ئێمە وەستاوین ودارەکانی لێواری جادە دەرۆن؛ یان گڵۆپە نیۆنەکان لەوەی کە بەدوای یەکدا هەڵدەبن ودەکووژێنەوە. پێدەچێ دەجوولێن. ئەم دیاردەیە کە هەڵە لە تێگەیشتنە لە جوولاّن، بە دیاردەی فای ( phi – phenomenon) ناو دەبرێ.

21. Jerome S. Bruner and Cecile C. Goodman , “ Value and as Organizing Factors in Perception” ,Journal of Abnomal psychology ,42 (1947) ,34
22. Navaho
23. Tense indicators
24. Kluckhohn
25. Leighton
26. Clyde kluckhohn and Dorothea Leighton,The Navaho(Cambridge,mass,1948), p.204
27. Dorothy D.Lee
28. Wintu
29. Dorothy D.Lee, “ conceptual Implication of an Indian language ”, philosophy of science ,5(1936),90



30. B. Russell ,History of western philosophy (London 1961), p. 212
31. Benjamin L. Whorf , “ The Relation of Habitual Thought and Behavior to language” pp. 705 -93. Carroll ,pp.134 – 159
32. Phases of cycles
33. plurals numbers
34. Cardinals
35. Aggregates
36. Idioms
37. Individual nouns
38. Mass nouns
39. Validity form
40. Aspects
41. Modal
42. Tensors
43. Eventing
44. Lee, op. cit.
45. *Ibid,pp.64 – 95*
46. *Ibid,p*.102
47. Retrospect
48. Harry Hoijer , “ cultural Implications of some Navaho linguistic categories ”, *Language* , 27(1951),111 – 20.
49. *Ibid,p.115*
50. *Ibid,p.117*
51. Kluckhohn and leighton , op. cit., pp 227 – 28





## پێشەکیی وەرگێڕ

ئەم وتارە توێژینەوەیەکی وردیی زمانییە کە زۆر لایەنی باس نەکراوی لە بارەی شیعرەکانی باباتاهیرەوە تێدایە، بە پێویستم زانی سەرباری ئەمانە، بۆچوونی ئەدیب و توێژەری بەناوبانگ «د.عەبدولحسێن زەرین کوب»یش بکەمە پاڵپشتی تێبینییەکانی ئەم وتارەی مامۆستا چەنگیز مەولایی:

***«... پێویستە ئەو فەهلەویاتەی دراونەتە پاڵ بابا تاهیر، لە بواری زمان و کێشەوە، وێڕای بەسەرهاتی خۆی و شیعرەکانی تاوتوێ بکرێن کە لە تەزکەرە کۆنەکانی وەك ـــ لباب الالباب وتذكرة الشعرا و ـــ دا یادی نەکراوە.***

***بە رواڵەت یەکەمجار کە شیعرەکانی بلاوکراونەتەوە، نزیکەی سەدەی نۆیەمی کۆچی بووە، بەلام ئەو شێوە فەهلەویاتەی ئێستا لەبەردەستدان و کۆنترینیان دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی نۆیەم، بێ شك کۆنترین شێوەی فەهلەویاتەکە نییە، چونکە لە کتێبی (المعجم)ی شەمسی قەیس دا نموونەی شیعری چیاکان (جبال) هەبوون، و لەرووی دەنگ و بێژکردن و تەنانەت کێشیشەوە لەگەڵ ئەو فەهلەویاتەی دراونەتە پاڵ بابا تاهیر جیاوازن. ئەم خاڵە دەریدەخات کە لە سەدەی نۆیەم بە دواوە کاتێ کە دووبەیتییەکانی بابا تاهیر بلاو کراونەتەوە، لەسەر کێش و بە زاراوەیەکی نوێ داڕێژراونەتەوە و ـــ جیا لەوەی لە سەدەی هەفتەم و بەر لەوە بووە ـــ بۆیەشیان گۆڕیون کە زۆربەی فارس زمانەکان لێیان تێبگەن*** » **( زرين كوب، عبدوالحسين" جستجو در تصوف: ص ١٨٨، ١٣٦٩)**

زۆربەی لێکۆڵەران لە سەر ئەم رایە کۆکن کە زۆرینەی ئەو چوارینانەی دراونەتە پاڵ باباتاهر لە قۆناغەکانی دواتردا هاتوونەتە ناو کۆمەڵە شیعرییەکانییەوە. بەلاّم ئەمە کە کام دووبەیتی سەرەکیی و کامە لکێنراوە



بەسانایی دەست نیشان ناکرێ. مخابن دەستنووسێکی کۆن و جێ متمانە و نزیك لە سەردەمی شاعیرەکە لەم دوبەیتییانە بەجێ نەماوە کە بکرێ بە بەراوردکردنیان رەسەنەکان لە نارەسەنەکان جیابکرێنەوە. کۆنترین دەستنووس وا ئێستا لە شیعرەکانی باباتاهر لەبەر دەستدایە دەستنووسەکەی، مۆزەخانەی قونیە (رێکەوتی ٨٤٨)یە کە مامۆستا ***موجتەبا مینەوی***، نموونەیەکی لە گۆڤاری کۆلێژی ئادابی زانکۆی تاران (مجلەی دانشکدە ٔ ادبيات دانشگاه تهران) بلاّوکردوەتەوە[1] و دواتر مامۆستا ***ئەدیب تووسی*** و دکتۆر ***مێهردادی بەهار*** شرۆڤەیان کردووە و لێکیان داوەتەوە.[2] ئەگەر ئەم گریمانەیەی ***مینۆرسکی*** وەراست گەڕێ کە باباتاهیر لە سەردەمی ئالی بوویە و خزمەکانیان واتە کاکۆییەکاندا دەژیا ـــ چونکە ئەم خانەدانە تا لەشکرکێشیی ***ئیبراهیم یەنالی*** (سەلجوقی) لە ساڵی ٤٣٥ لە هەمەدان حوکمڕانیان دەکرد ـــ[3] ئەو کاتە، سەردەمی ژیانی شاعیرەکە و رێکەوتی نووسینی ئەم دەستنووسە نزیکەی چوارسەدەیان نێوان دەبێ. دەفتەرێکی دەستنووس بە ژمارە **٩٠٠** لە کتێبخانەی مەجلیسی شۆڕای میللی بەناو نیشانی « تذكرە ٔ شعرا » یان « سفینەی اشعار» پارێزراوە کە لە سەدەی هەشتەمی کۆچیدا نووسراوە و تێیدا چەند شێعرێك بە ناونیشانی «الفهلويات» و « النيريزيات» هاتوون. هێندێ لە لێکۆڵەران، بۆنموونە ئەدیب تووسی، پێیوایە چەند دووبەیتییەکی ئەم دەستنووسە، لە رووی ناوەرۆکەکەیانەوە، پێدەچێ هی باباتاهیر بن[4]، ئەگەرچی لە رووی مێژووە دەکەونە پێش دەستنووسەکەی قونیە. ئەم دەستنووسە، چونکە (کاتب)ەکەی ئاماژەی بە شاعیرەکەی نەکردووە، ناکرێ زۆر جێی متمانە بێت. ئەگەرچی بە پارێزەوە لە هێندێ بواردا دەکرێ بۆ راستکردنەوەی دژەگوتنەکانی دەستنووسی قونیە سوودی لێ وەربگیرێ، دەستنووسەکەی قونیەش، بە پێچەوانەی مێژینە

ڕێژەییەکەی بە سەر دەسنووسەکانی دیکەدا، تەنیا دوو «پارچە » و هەشت دووبەیتی لە خۆگرتووە، پارچەیەکیان سێ بەیتە و ئەوی دیکەیان شەش بەیتە.

وێڕای ئەمە، ئەم رادەکەمەش لە رووی زمانییەوە چەند خاڵێکی زۆر گرنگی تێدایە کە دەکرێ، بەپشت بەستن بەوانە، هێندێ تایبەتیی ڕێزمانی و تایبەتمەندییەکانی زاری شاعیرەکە تارادەیەك روون بکرێتەوە. لە لایەکی دیکەشەوە، ئەو نیشانانەی لە ئارادا هەن دەریدەخەن کە ئەم دەستنووسە بە بەراورد لەگەڵ دەستنووسەکانی دیکە کەمتر لە لایەن کاتبانەوە دەستی تێوەردراوە یان گۆڕاوە و بەیتەکان بە ڕەسەنی یان لانی کەمی نزیك بە ڕەسەن پارێزراون. دەستنووسەکانی دیکە دەگەڕێنەوە بۆ سەدەی دەیەم و سەدەکانی دواتر، چونکە *پەیڕەویی ئەزکایی*، لەوتارێکیدا، هەموو دەستنووسەکانی، بە ئاماژە کردن بە ڕێکەوتی نووسینەوەیان، بەریز نووسیون[٥]، سەرلە نوێ باسکردنەوەیان پێویست ناکات. کەواتە، لەم لێکدانەوەیەی ئێستادا، وێڕای ئاماژەکردن بە هۆکارەکانی دەست تێوردان و گۆڕینی وشەکانی فەهلەویاتی باباتاهیر، ئاماژە بەچەند بەڵگە ونیشانەیەك لە دەستنووسەکەی مۆزەخانەی قونیەش دەکەم کە دەتوانێ بۆ دوایین بژاری دوو بەیتییەکان وەهلاواردنی دووبەیتیە ڕەسەنەکانی باباتاهیر لە لکێنراوەکان، بەکاربێت.

پێدەچێ کە کێشی تایبەتی ئەم گۆرانییانە وگرنگیدانی شاعیرانی خۆجێی بە بەکارهێنانی وشە و تایبەتییەکانی تری دیالێکتیکی هۆی گۆڕان و دەست تێوەردانی گۆرانییە خۆجێیە دێرینەکان، بە تایبەت گۆرانییەکانی باباتاهیر بوو بێت. لە راستیدا، ئەدیبان ئەم چۆنێتییە نەناسراوانەیان لە شێعردا بە پێچەوانەی یاساکانی ڕەوانبێژی زانیوە. دەزانین کە دوو بەیتییە دێرین و ڕەسەنەکان سەرەڕای کێشی باو و ناسراوی مفاعیلن مفاعیلن فعولن (بەحری هەزەجی موسەددەسی



مەحزوف) لە سەر کێشی [فاعیلاتن (یامفعولاتن) مفاعیلن فعولن] یش دابەشکراون. تەنانەت شاعیر لە بژاری ئەفاعیلی عەروزیدا بە ئارەزووی خۆی دەیتوانی لە دووبەیتییەکدا لادێڕێك لە سەر کێشی (مفاعیلن مفاعیلن فعولن )و لادێڕەکەی دیکەیان لە سەر کێشی فاعلاتن مفاعیلن فعولن (بحر مشاکل مسدس محذوف) بڵێ و ئەمەش هەمان شتە کە شەمسی قەیسی رازی، شاعیرانی خۆجێیی یا فەهلەوی بێژانی بەلادەر ناو بردووە. بە گومانی شەمسی قەیس، بێژەرانی ئەم دوو بەیتییانە، لەگەڵ بەکارهێنانی پێی (فاعلاتن یا مفعولاتن)دا لە جیاتی (مفاعیلن)، پێیەکانی چەند کێشیان تێکەڵاو کردووە و لەیاسا ئاشکراکانی عەروز لایان داوە[٦]. لە قۆناخەکانی دواتریشدا کەسانی خاوەن زەوق، لە جیاتی ئەوەیکە لانیکەم وەك شەمسی قەیس سیما جیاکەرەوەکانی کێشی فەهلەویات لەگەڵ شێعری عەروزیی فارسیدا دەست نیشان بکەن، چونکە ئەم دوو بەیتییانەیان لەگەڵ پێوەرە عەروزییەکان وبنەما ڕەوانبێژییەکانی خۆیان یەکانگیر نەدەدیت، لەهەموجێ، بەدەست تێوەردانی پێیەکان، هەم کێشەکانیان لەگەڵ کێشی (هزج مسدس محذوف)یەك خستەوە وهەمیش زمانی ئەم دوو بەیتییانەیان ـــ کە بە زاراوەیەکی ناوچەیی سیمای ڕێزمانی تایبەت بە خۆی هەبووە ـــ گۆڕیوە. بەم جۆرە، لە زۆربەی ئەم شێعرانەدا کە لە جۆری فەهلەویاتی کۆنن، وێڕای ئەوەی گەلێ وشەی فارسی جێنشینی کۆمەڵێ وشەی زاراوەکە بوون، پێکهاتەی ڕێزمانیی دەستە واژەکانیش بە تەواوی گۆڕاوە و سیما و شێوەیەکی نوێی بە خۆوە گرتووە. بۆ نموونە دووبەیتییەك بە زاراوەی خەڵکی ناوچەی «زەنگان و هەمەدان» لە (المعجم)دا، هاتووە کە هەرچوار لادێڕەکەی لە سەرکێشی (فاعلاتن مفاعیلن فعولن)ە، هەمان کێش کە شەمسی قەیس بەئیرادی دادەنا، ئەم دووبەیتییە بەمجۆرەیە:

ارکـریمون خـــواری اج که ترسی
ورکشیمون سـاری(؟) اج که ترسی
ازینیمــــه دلــــی نتـــــرسم اج کیح
ای گهان دل تەداری اج که ترسی[٧]

ئەم دووبەیتییە ئەمڕۆکەش ناسراوە و لە زۆربەی دەستنووسە چاپکراوەکانی دیوانی باباتاهیر دا دێتە بەرچاو، بەم جیاوازییەوە کە لە جیاتی جۆرە دیالیکتییەکانی [لوڕی]، وشەی فارسی جێی گرتۆتەوە و گرنگتر لەوانەش، بە بەرودواکردنی بەشەکانی ئاخاوتن، کێشەکەی بە وردی لەگەڵ (بحرهزج مسدس محذوف) جووت بووە:

کُشتیمان گر به زاری از که ترسی
برونی گر به خواری از که ترسی
بەاین نیمه دل از کس مو نترسم
دو عـالم دل ته داری ازکه ترسی

وەیان، لە دەفتەری دەستنووسی ڕێکەوتی ١٢٣٦ ی کتێبخانەی میللی تەورێز گۆرانییەك بەم چەشنەی خوارەوە دەبینرێ:

دلـــــم از دست تـــو دایـــم غـمـیـن بی
سرینم خشت و پـــایینم (؟) زمین بی
جـــرمم ایـن کـــه پی تـــو دوست دارم
که هرکه ته دوست داری حالش این بی



لەم دوو بەیتییەدا، هەردوو لادێڕی بەیتی یەکەم لە سەرکێشی (هزج مسدس محذوف) ولادێڕەکانی بەیتی دووەم لە سەر کێشی (مشاکل مسدس محذوف)ن" بەلاّم دواتر، کاتبێکی دیکە ئەم دەستنووسەی دەکەوێتە بەر دەست وبە هەڵکەوت چەند دوو بەیتیی دیکەشی لە پەراوێزدا بەم کۆمەڵە زیاد کردووە، لەوانەیە لە ژێر کاریگەریی ڕێنوێنییەکانی کێشناسەکاندا کێشناسان، لێکدانی بەشەکانی چەند کێشیان وێکڕا بە نادروست زانیوە و، بۆچارەسەرکردنی ناتەواییە عەروزییەکانی، بە خەتێکی وردتر و بەجیا لە خەتی دەقەکە، بەیتەکانیان بەم شێوەیەی خوارەوە ڕاست کردۆتەوە:

دلـــــم از دست تـــــو دایــم غمینه
بــه بــــــالین خشتم و بستر زمینه
همین جرمم که من ته دوست دارم
هـــرکست دوست داری حـالش اینه

بابەتێکی دیکە کە دەبێ لەبیری نەکەین و پێویستیی بەروونکردنەوە و پاساوی تایبەتییە، ئاستە مۆرفۆلۆژی و سینتاکسیی و فۆنۆلۆژییەکانی شێعرەکانی باباتاهیرە؛ بە مبەستی جیاکردنەوەی دووبەیتییە ڕەسەنەکان لە دوو بەیتییە ناڕەسەنەکان. ئاشکرایە کە ئەو دوو بەتییانەی بەم شێوەیەی ئێستا لە دەستنووسە چاپکراوەکاندا هەن، لەبەرگۆڕانیان لە درێژایی زەمەندا، هەرگیز بۆ ئەم مەبەستە شیاو نین. بەگومانی نووسەری ئەم دێڕانە، بۆ گەیشتن بەم مەبەستە دەکرێ تا ڕادەیەك سوود لە دەستنووسەکەی قونییە وەربگیرێ. بەرچاوترین تایبەتیی سینتاکسی کە لە تاوتوێ کردنی ئەم دەستنووسەوە توێژەرەکە بەدەستی دێنێ، بینرانی کاری ڕابردووی تێپەڕ لەم دوو بەیتییانەدایە کە پێشینەکەی

دەگەڕێتەوە بۆ زمانە ناونجییەکانی رۆژئاوای ئێران. پێویستی بە روون کردنەوەیە کە لەزمانی ناونجیی رۆژئاوای ئێراندا، واتە پەهلەوی ئەشکانی و فارسیی ناوەراست (پەهلەوی ساسانی)دا دوو جۆرە کاری رابردوو بە دوو داڕشتنی بەتەواوی جیاواز لە ئارادا هەن. یەکیان کاری رابردووی تێنەپەڕە کە رەگی رابردوو بە شێوە جۆراوجۆرەکانی ئێستای هەواڵدانی (مضارع اخباری)کاری -h «بوون» رۆدەنرێ (تەنیا دۆخی ریزپەڕ لەمانە، سێیەم کەسی تاکە کە تێیدا پێویستی بەکاری «بوون» نییە ) وەك:

| (کۆ) | (تاك) | |
|---|---|---|
| būd hēm ( būmād :پەهلەوی ئەشکانی) | būd hēm | یەکەم کەس |
| būd hēd | būd hē ( ē : پەهلەوی ئەشکانی ) | دووەم کەس |
| būd hēnd (ahēnd :پەهلەوی ئەشکانی) | būd | سێیەم کەس |

وئەوی دیکە کاری رابردووی تێپەڕە. ئەم جۆرەکارەی رابردوو بە یارمەتیی کارا ( *agent* )و رەگی رابردوو دروست دەبێ. ئەم جۆرەکارەی رابردوو، بەبێ ئەوەی بگۆڕێ، بەتەنیایی بۆ هەر سێ کەس و هەر دوو ژمارە بەکار دێت و کەسی کارەکە نە لەرووی دیارخەرەکانی کارەکانەوە( شناسەهای فعلی) بەڵکوو لە رووی بکەری مەنتیقییەوە دەردەکەوێ؛ وەك :



| (کۆ) | (تاك) | |
|---|---|---|
| amā zad | man zad | یەکەم کەس |
| ašma zad | to zad | دووەم کەس |
| oyŝan / awēŝan zad | oy / awē zad | سێیەم کەس |

ئەگەر رستەکە بەرکاری راستەوخۆی تێدا بێت، چ بەرکارەکە لە رستەکە دا دەرکەوتبێت چ شاراوە بێت، لەدوای رەگی رابردوودا سیغەیەکی کاری ئێستا لە رەگی کاری -h دێت کە ئەم کارە لە رووی کەس و ژمارەوە لەگەڵ بەرکاری رستەکەدا رێك دەکەوێ، نەك لەگەڵ بکەردا؛ وەك:

to Mardān did hēnd «مەردان لە لایەن تۆوە بینران = تۆ مەردانت دی». لەم رستەیەدا، to (جێناوی دووەم کەسی تاك: « تۆ » ) بکەری مەنتیقی یا کارای رستەکەیە، mardān، *مەردان* بکەری رێزمانی و بەرکاری مەنتیقی رستەکەیە.dīd hēnd کاری رابردووی تێپەڕە کە لەگەڵ بەرکاری رستەکە واتە mardān دا رێککەوتووە و بە شێوەی کۆ هاتووە.[٨]

خاڵی جێگای سەرنج ئەمەیە کە، رۆنانی کاری رابردووی تێپەڕی قۆناغی ناوەڕاست، ئەگەرچی بە فارسی دەری (قۆناغی نوێ) نەگەیشتووە، بەهەمان چۆنێتی و تایبەتی کە لە دەقە جێماوەکانی زمانە ناونجییەکانی رۆژواوای ئێران، لە دەستنووسەکەی قونیەشدا دەبینرێ، بە دڵنیاییەوە دەکرێ بگوترێ کە، لە **٢٥** بەیتی ئاماژە پێکراوی ئەم نوسخەیەدا، لە هەرجێ کاری رابردووی تێپەڕ

بەکارهاتووە تەنیا یەك دانەی ریزپەڕ کە بە پێچەوانەی ئەم ڕێسایە بێت، نایەتە بەرچاو. بۆ نموونە لەم دووبەتییەی خوارەوەدا:

یـــاکِمْ دُردی هَنی دَرْیـهْ نَبُدْ یار
یاکِم خوُر دید گمان پیدا نَبُد یار
مَنْ اذ آن رُو بـدامـــان تـــه زد دست
ده گـــــردونت پـــرو پـــایی نَبدُ یار(۹)

کاری رابردووی تێپەڕ لەم دەستەواژانەی خوارەوە دەبینرێ :

ـــ کِمْ دُردی: « لە لایەن منەوە بینرا = دُرم دی »، ( « کِمْ » لە « کە » ئامرازی پێوەندی + « ـــ م » جێناوی لکاوی یەکەم کەسی تاك و بکەری مەنتیقی ڕستەکە؛ « دُر» بەرکاری مەنتیقی و بکەری ڕێزمانی؛ « دی = di [کورتکراوەی« دید »]: کاری رابردووی تێپەڕی یەکەم کەسی تاکە.چونکە بەرکاری مەنتیقی ڕستەکە، واتە « دُر» ناوی تاکە راست وەك زمانە ناوچەییەکانی ڕۆژئاوای ئێران، کاری بە بێ دیارخەر[راناوی لکاو] بەکارهاتووە.)

ـــ کم خور دید: " خۆر لە لایەن منەوە دیترا = خۆرم دیت."
( وەك، کم در دی)

ـــ من... زد دست: " لە لایەن منەوە دەستی لێدرا = دەستم لێدا."

یان لە لادێڕی " *خویش و بیگانگان سنگم زد ای یار*" (خزم و بێگانە بەردیان پێدادام ئەی یار) دا، سەرەڕای ئەوەی کە بکەری ڕستەکە کۆیە و دەبوو کارەکەش بە شێوەی کۆ بێت، بە پێی هەمان یاسای کە پێشتر ئاماژەی پێکرا، کاری ڕستەکە بە بێ دیارخەری کار (راناوی لکاو) بەکار هاتووە.

سیمایەکی بەرچاوی دیکەی سینتاکسیی بەکارهێنانی جێناوی بکەریی و نابکەری، یەکەم کەسی تاکە، لەم گۆرانییانە دا. لە زمانە ناوچەییەکانی ڕۆژئاوای



ئێرانیش، جێناوی یەکەم کەس بە دوو شێوەی بکەری و نابکەری لە ڕستە دا دەردەکەوت. لە دۆخی بکەریدا، لە جۆری az (وەك azəm لە ئاڤێستاییدا ) ویان an لە دۆخی بکەریدا لە man (وەك manā و دۆخی خستنەسەر لەزمانی ئەڤێستایی و فارسی کۆندا )بەکاردەبرا. هەڵبەت، لەو ئاسەوارانەی لەم دواییانەدا کە بە زمانی پەهلەوی ساسانی نووسراون، جێناوی نابکەریی manā بەرەبەرە بووەتە جێ نشینی az یان an و لە فارسی دەریدا بە تەواوی سڕاوەتەوە.

نموونە بۆ بەکارهێنانی دۆخی بکەری جێناوی یەکەم کەسی « ئەز = az » لە دووبەیتییەکانی باباتاهیردا:

(از (= az ) آن اسپیده بازم همدانی
ای تنهـــــــایی کـــــــرم نـچیـروانـی)
✽✽✽✽✽✽✽✽✽✽✽✽✽✽✽✽✽✽✽
(جرمم اینه که از (= az )ته دوست دارم
نـــه خـونم کـــرد ونم راهـی زد ای یــــار )

نموونە بۆبەکارهێنانی جێناوی نابکەری « مَن = man » :

( فنـــــا می نشه اینِ ود که من کـــرد
به من هم آن کرن هرود که من کرد )
✽✽✽✽✽✽✽✽✽✽✽✽✽✽✽✽✽✽

( آنکش اَد آفـــری گردون گردان
آنِش اَدْ ساتً من انداجه ور کرد )

لەو نموونانەی شیاوی سەرنجدانن لە بواری تایبەتمەندییە دەنگییەکان و دارِشتن و سیمای وشە لە دووبەیتییەکانی دەستنووسی قونیەدا دەکرێ ئاماژە بە بەکارهێنانی رەگی ئێستای « هرز ( = hirz- ) لە جێی « هل ــ (هێڵ)» رەگی ئێستا لە « هِشتن (هێشتن)»، رەگی ئێستای « کِر ــ ( = kar- ) لە جێی « کُن » و رەگی رابردووی « درد(دەرد)» (لە وانەیە dird یا derd لە جێی « داشت » لە فارسیی دەریدا بکرێ ئەو یاسا دەنگییانەی بەسەر ئەم وشانەدا زاڵن لە هەمان ئەو یاسایانە پێرِەوەی دەکەن کە پەهلوی ئەشکانی لە فارسی ناوەراست جیادەکاتەوە. دەبێ ئەمەمان لە بەرچاوبێت کە رِەگی «هِـل » و «هرز ــ»، هەردووك لەیەك ریشەن. بنجی ئەم رەگانە لە ئێرانی کـۆندا -harz * بە واتـــای « رەهـــا کردن » بووە. لـــەم رەگـــە، لە زمانی ئـــاڤێستاییدا، رەگی ئێستای harəza و لـــە فارسی کۆندا رەگی ئێستای -harda رۆنراوە (فۆنیمی /z/ لە دەنگی هیند و ئەوروپی[ĝ] وەرگیراوە کە لە فارسی کۆندا بووە بە d[١٠]. جۆرەکەی لە فارسی بە گۆڕانی /rd/ بە /l/ لە فارسی ناوەراستدا hil و لە فارسی دەریدا گۆڕاوە بە « هِـل ». و لە لایەکی دیکەشەوە، رەگی ئێستای -harəza لە زمانی ئاڤێستاییدا، بە لابردنی بزوێنی a، لە پەهلوی ئەشکانیدا بە شێوەی -hirz [١١] و لە زاری هەمەدانیدا بە شێوەی « هرز ـــ » ماوەتەوە. هەر وەها بنەچەکی رەگی ئێستای « کِر ــ » لـە زاری هەمەدانیدا و « کُن » لە فارسی دەریدا یەکە. « کُن » لە فارسیی دەریدا لە جۆری -kun لە فارسیی ناوەراستدا و ئەویش لە جۆری -(a) kunav لە فارسیی کۆندا (ئێرانیی کۆن) - krnav *وەرگیراوە کەچی، رەگی کاری ئێستا لە زاری هەمەدانیدا دەکرێ لەگەڵ رەگی ئێستای -kar لە پەهلوی ئەشکانیدا و - kərə لە رەگی -kar لەزمانی ئاڤێستاییدا بەراوردبکرێ. دردیش لە دوبەیتییەکانی باباتاهیر دا لەوانەیە لە dirdی پەهلوی ئەشکانی و لە -drta*لە ئێرانی کۆندا (وەك



ئاڤێستاییی dərəta هاوەڵناوی بەرکاری لە رەگی -dar « داشتن »)وەرگیرابێ. بەلاَم « داشت » لە فارسیی دەریدا پاشماوەی رەگی رابردووی dāŝt لە فارسی ناوەراستەکە لە بنجی -dar لە سەرکێشی -kār وkāŝt رۆنراوە.[١٢]

لە دەستنووسەکەی مۆزەخانەی قونیەدا لە هەمووجێیەکدا ئامرازی« اَز» بە شێوەی « اژ» نووسراوە و ئەمە نوێنەری گۆڕانێکی دەنگی ترە کە زمان و زارەکانی باکووری رۆژئاوا لەدەستەی باشوری رۆژئاوا جیادەکاتەوە. چونکو، هەروەك دەزانین، دەنگی کپی čی ناونجی ئێرانی کۆن لە فارسیی ناوەراستدا بە z و لە پەهلوی ئەشکانیدا بە ž دەگۆڕِێ. کەواتە، جۆری کۆنەی hačā (لە دەقی ئاڤێستاییی و فارسیی کۆندا ) لە فارسیی ناوەراستدا دەبێتە az و لە پەهلویی ئەشکانیدا دەبێتە až و جۆری نوێی لە زاری هەمەدانیی کۆندا بە شێوەی « اژ» ماوەتەوە. بەم پێیە، دەکرێ بڵێین لەوانەیە فۆنیمی « ج» لە وشەی وەك « رۆج، سوج، واج » لە دوو بەیتییەکانی باباتاهیردا پێناسەی دەنگی ž بێت کە لە وشەی وەك rož (رۆژ)، sož (سۆژ) و waž (واژ)دا بێژکرا بن.

بە پێی ئەوەی تائێستا پێشکەش کرا، ئێستا دەکرێ سیمای سەرەکی دووبەیتییەکانی باباتاهێر بنەخشێنرێن و بەشێك لەیاسای گشتی لە پێوەندی لەگەڵ ئەوانەدا بخرێتەروو.

لەم دوو بەیتییانەدا، یاسا و رێسای عەرووزی، هەروەك شەمسی قەیس هێناوێتە ئاراوە پێی وایە لادان لەوانە هەڵەیەکی زەقە، لە هەمووجێیەکدا راست نییە. نابێ لە بیری بکەین کە، بە وتەی مامۆستا خانلەری، ***کێشی شێعر ملکەچی زەوقە و زەوقیش ملکەچی عادەتە و یاسای کێش فرمانێکی ئەزەلی (نەگۆڕ) نییە کە لادان لێی رەوا نە بێت؛ بەڵکوو ئەم یاسایانە دەبێ لە عورف وعادەت هەڵێنجرابن. کەواتە هەرچی زەوقی زۆرینەی گروپێك پەسندی دەکات راستە و بۆخۆی یاسایە و بەلادەر تۆمەتبارکردنی هەڵەیە***[١٣]. کەواتە، بەردەوام

دەبێ ئەو جیاوازییانەی لە نێوان کێشی فەهلەویاتی کۆن و شیعری عەرووزی فارسیدا هەیە لە بیرنەکرێن ولە بەکارهێنانی زەوق و مەزاجدا بۆ یەکانگیرکردنی کێشی ئەم گۆرانییانە لەگەڵ ئەو کێشانەی شەمسی قەیس بە ڕاستیان دادەنێ خۆ بپارێزرێ.

لەم دوو بەیتییانەدا، بەپێی ئەوەی لە دەستنووسەکەی قونیەدا هاتووە ڕۆنانی کاری رابردووی تێپەڕ لە وانەیە بە هەمان چۆنێتی کە لە دەقە بە جێماوەکانی زمانە کۆنە ئێرانییەکاندا دەبینرێ، پارێزراوە. کەواتە، ئەو دوو بەیتییانەی کە تێیاندا کاری رابردوو بە پێی رێزمانی فارسیی دەری گەردان کراوە و تێیاندا ڕۆنانی کاری رابردووی تێپەڕ نایەتە بەرچاو، یان هی باباتاهیرنین و یان کاتبەکان وایان گۆڕیون کە سیمای سەرەکی خۆیان لە دەست داوە، و لەبەر ئەوەیکە دەستنووسەکەی قۆنیە بەشێکی بچووکی شێعرەکانی شاعیرەکە دەگرێتەوە و جیا لەو دەستنووسە کۆنە، دەستنووسێکی دیکە لەبەردەستدا نییە کە بکرێ بە پشت بەستن بەو سیما سەرەکییەکەیان دیاری بکرێ، بەناچار ئەم دووبەیتییانە دەبێ بەدووبەیتیی گوماناوی دابنرێن.

بەو پێیە کە بە کـــارهێنانی جێنـــاوی بکـــەری و نابکـــەری یەکەم کەسی تـــاك واتـــە «ئەز» و«من» لە دەستنووسەکەی قونییەدا بەرچاون، بە دڵنیاییەوە دەکرێ بڵێین لە هێندێ بواردا کە جێناوی کەسیی تاك لە دۆخی بکەریدایە، وشەی « ئەز» و، لە هێندی بواردا کە ئەم جێناوە لە دۆخی نابکەریدایە، دەکرێ وشەی « من »جێی جۆرەکانی دیکەی پڕکاتەوە.

لەکاتی ساغ کردنەوە و راست کردنەوەی ئەم دووبەیتییانەدا لە بەکارهێنانی رێبازی « پێشخستنی سادە بەسەر دژواردا » دەبێ خۆببوێرێ کە دژی ئەو بنەما گرنگەی *Letio difficlior* (پێشخستنی ناباو بەسەر باودا)یە لە راستکردنەوەی دەقە کۆنەکاندا، و دایمە لە بەرچاومان بێت کە مەیل و حەزی



خاوەن زەوقان بەردەوام لەسەر ئەوە بووە جۆرە کۆن و لەمێژینەکان، کە تێگەیشتنیان دژوارە یان بە کـــارهێنانیان لە ئاسەواری ئەدەبیدا بە پێچەوانەی رەوانبێژیی دەردەکەوێ، بە شێوەیەك دەرکەوێ کە لـــەگەڵ یـــاســـا وپێوەرە پەسندکـــراوە رەوانبێژییەکـــاندا جوت بێت. کەواتە ئەگەری ئەوەی کە جۆرەکانی وەك «کەرێم ( karem ) » یا «واجەم» ( wājam لەوانەیە wāžam) لە قۆناخەکانی دواتردا بووبنە «کُنَم» و«گویَم»" کەچی ئەگەر بە پێچەوانەی ئەمەوە بێت واتە گۆڕینی و یان دەستکاری کردنی چەند فۆنیمێك لە وشەیەکی ناسراوی وەك « کُنَم » و«گویَم » بە « کَرِم » و« واجَم » تارادەیەکی زۆر ناکرێ.

هەروەك چۆن لە سەرەوە ئاماژەی پێکرا، لەم لێکدانەوەیەدا لە بواری زمانییەوە تەنیا ئاماژەم بە چەند هەڵێنجانێك لە دەستنووسەکەی قونیە کردووە و ئەمەش دەتوانێ لەچارەسەرکردنی کێشە و گرفتە زمانییەکانی دووبەیتییەکانی باباتاهیردا بەکاری توێژەران بێت. بەواتایەکی دیکە، ئامادەکارییەکم کردووە بۆ سەرلە نوێ راست کردنەوەی دووبەیتییەکانی باباتاهیر کە لە سەرەتای پەیدا بوونیانەوە تائێستا لە هیچ جۆرە گۆڕانێك ودەست تێوردانێك نەپارێزراون. سەرەڕای ئەمانەش. نووسەری ئەم دێڕانە پێی وایە کە ئەم مەقوولانە بەتەنیایی بۆ پێشکەشکردنی دەقێکی راستکراوەی دووبەیتییەکانی باباتاهیر بەس نین؛ بەڵکوو ئاشنابوون لەگەڵ شێوەی بیرکردنەوە، روانگە و هزری شاعیر و بابەتی تری لەو چەشنانە جێگای سەرنجن بۆ راستکردنەوەی ئەم گۆرانییانە و هەڵاواردنی دووبەیتییە گوماناویی ولکاوەکانیش. بەڵام، لەم بوارەدا، دەبێ شارەزایەك بۆچوونی خۆی ڕابگەیەنێ کە دەسەڵاتێکی تەواوی بەسەر بابەتەکەدا هەیە.

## پەراوێز

١/ مجتبى مینوى، از «خزاین ترکیه »، مجلەی دانشکدۀ ادبیات دانشگاە تهران، سال چهارم (١٣٣٥ )، شمارە م، ص ٥٦ ــ ٥٨

٢/ ادیب طوسى، « فهلویات لُــرى »، نشریـــەى دانشکدۀ ادبیات تبریز، سال دهم، (بهار ١٣٣٧)، شمارە اول، ص ٢ ــ ٨ "مهرداد بهار، جستارى درفرهنگ ایران، تهران ١٣٧٣، ص ٢٦٧ ــ ٢٨٠

3\ *V. Minorsky , Bābā - Tāhir EI², leiden 1976*

٤/ ادیب طوسى، همان، ص ٨

٥/ پرویز اژکایى، باباطاهر نامە، انتشارات توس، تهران ١٣٧٥، ص ١٤٥ ــ ١٤٩

٦/ شمس الدین محمد بن قیس الرازى، المعجم فى معاییراشعارالعجم، تصحیح مدرس رضوى، انتشارات دانشگاە تهران ١٣٣٦، ص ١٠٥ ،١٧٣ ــ ١٧٤

٧/ همان، ص ١٥٧

٨/ لەبارەی ڕۆنانی رابردووی تێپەڕ لە زمانە ئێرانییەکانی ناوەڕاستی ڕۆژئاوایی ←

*C. saleman , Mitteipersisch , in Grundriss der iranischen philolgie , B.I, strassburg , 1895 – 1901.p.314 ;*

*C. J.Brunner , A syntax of western Middle Iranian , carvan books , Delmar , New York 1997 , pp. 188 – 182*

ژالە آموزگار ــ احمد تفضلى، زبان پهلوى، ادبیات ودستور آن، انتشارات معین، تهران ١٣٧٣، ص ٦٦ – ٦٧" محسن ابولقاسمى، دستورتاریخى زبان فارسى، انتشارات سمت، تهران ١٣٧٥، ص ١٧٣" همو، راهنماى زبانهاى باستانى ایران، ج ٢، انتشارات، سمت، تهران ١٣٧٦، ص ٥٤

٩/ واتای ئەم دووبەیتییە بەمجۆرەیە:



« کاتێ کە دورڕم دیت هێشتا دەریا نەبوو، ئەی یار
کاتێ کە ڕۆژم دیت جیهان بەدیارنەبوو، ئەی یار
من لەورۆژەوە دەستە و داوێنی تۆ بووم (کە) لە
گـــەردوونی تۆدا پـــەڕو پـایەك نەبوو ئەی یـــــار. »

مهرداد بهار، همان، ص ٢٧١

10\ *R.G.kent , old Persian , Grammar , Texts ,lexicon , New Haven 1953 ,p.33*

11\ *Cf.W.B.Henninc ,Das verbum ,des Mittelpersisehen der Turfanfragmente zll , 1933 , p.169*

١٢/ محسن ابوالقاسمى، مادەهاى فعلهاى فارسى درى، انتشارات ققنوس، تهرا ١٣٧٣، ص ٥٢.

١٣/ پرویز ناتل خانلرى ،وزن شعر فارسى، انتشارات بنیاد فرهنگ ایران، تهران ١٣٦٧، ص ٦٦

## سەرچاوە

نامەی فرهنگستان: چند نکتە دربار تصحیح دوبیتى هاى باباطاهر (صص ٧٤ ــ ٨)



